کتێب: سەرکەوتن دوای شکست.
جۆری کتێب: پەرەپێدانی مرۆیی.
نووسینی: ڕەوەند سەباح. دڵشاد کاوانی.
هەڵەچن: دڵشاد کاوانی
نەخشەی بەرگ: ئیبراهیم سالح.
نەخشەسازی ناوەڕۆك: دڵشاد کاوانی.
تیراژ: ٥٠٠ دانە.
چاپی: یەکەم ساڵی ٢٠٢٢
چاپخانە: چوارچرا، سلێمانی.
نرخ: ٣٠٠٠ دینار.
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی (٢٢٦) ساڵی (٢٠٢٢) ی پێدراوە.

# دەلاقە...

ڕاستە ئێژن ڕێگای سەرکەوتن بۆ کەس گوڵڕێژ نەکراوە، بەڵکوو بە قەرەم و قاری شکست دەور دراوە. پێویستە تاوناتاوێک ئاوڕێك لە شکست و کەوتنەکانتان بدەنەوە و تۆزێک بە هێمنی تێوەڕامێنن، ئینجا هەڵستنەوە سەرپێ و تەپ و تۆزی کەوتنەکانتان لە خۆتان داوەشێنن، پاشانیش بەرەو پێشەوە هەنگاو بنێن. ولۆ[1] تامی ڕاستەقینەی سەرکەوتنەکان دەکەن. ئەگەر بەقا[2] بەوەناکەیت، پێویستە سەیرێکی ژیانی ئەستێرە بەناوبانگەکانی جیهان بکەیت، تا یەقینیت بێت، خۆری سەرکەوتن لە شەوەزەنگی تاریکی دا و لەپشت تەپۆڵکە چیاکانی شکست سەری دەرهێناوە، ئەوە بزانە ئەمان لە جیهانێکی پڕ لە کۆسپ و قۆرت و چاڵەوە، هاتوون و بوون بە ئەستێرەی درەوشاوەی جیهان.

وردە تەماشایەکی تەنک بگرینە ژیانی پڕ لە ناخۆشی و نەهامەتی و قوڕبەسەری کەساییەتییە بەناوبانگەکان، دەبینین دروستکردنی کۆڵەگەی سەرکەوتن لەسەر پاشماوەی بەردی بناغەی شکستەکانە. کۆشش و خەبات لە پێناوی ئامانجەکانی ژیان پێویستی بە قۆڵ هەڵماڵین و مل خستنە بەر بارە. مرۆڤ نابێت ئەوەندە نابوت و لاواز بێت لە هەر چەقینێك لە قوڕاوی ژیان دەستەوەستان بوەستێت و خۆی بەدەستەوە بدات.

ئەرخەیان[3] بە هەموو شکستێک هەنگاونانە بەرەو خۆرهەڵاتن، نەوەك قینات[4] بە خۆت بێنیت کە هەورێکی سست و بێهێز لەپێشت سەری قیت خۆی بکاتەوە و ڕێگا لەسەر دەرهێنانی گزنگی خۆرت بگرێت. بە جۆرێك پێویستە وەك ماسی بین، مەلە لە دژی تەوژمی شەپۆڵەکانی شکست بکەین. یان وەك هەڵۆ بین لە دوورەوە چاو لە ئامانجەکانمان ببڕین و

---

[1]-**ولۆ**: وەها، بەم شێوەیە، بەم چەشنە، بەم جۆرە.

[2] - **بەقا:** باوەڕ.

[3] -**ئەرخەیان**: دڵنیا.

[4] -**قینات:** یەقین، قەناعەت، باوەڕی.

بیانپێکین. دڵنیابە شکستەکان خەرمانی بەهرە و تواناکان دوو بەقەد خـۆی دەکەنـەوە. هەرچەنـدە شکستەکانیشـت وەك گـەڵای زەردی پـایز ڕێگـای ئامانجەکانت دابپۆشێت، ئەمە لەبیر مەکە لە بـەهاری تـازە پشـکۆی نـوێ دەردەکەنـەوە و شـنە بـای بـەهار دێـت و ڕۆحـە مردووەکـان زینـدوو دەکاتەوە.

شکست و سەرکەوتن دوو دوانەی لەیەك دانەبڕاون، وەك چۆن بەهار هیچ بەهایەکی لە وەرزەکاندا نییە بەبێ پایزی زەردهەڵگەڕاو. ولۆ سەرکەوتنیش هیچ بەها و واتایەکی دیکەی بەبێ شکسـت نییـە، هـەموو کـەوتنێك گـەر نەتکوژێت ئەوا بەهێزترت دەکات، هەموو سەرکەوتنێکیش بەبێ شکسـت، بێ بەهاو ئەرزشە. تا بزانیت ئاوی تاڤگە چەند شیرینە، دەبێت پێشتر ئاوی سوێری دەریات چێشتبێت. بۆ ئـەو مەبەسـتەش چاوێـك بـە چـیرۆکی ژیـانی چەند کەسایەتییەکی پیتۆر و لێزان و هەڵکەوتووەکانی جیهاني دا دەخشێنین بۆ ئەزموون وەرگرتن.

لێرەدا تەنیا مەبەستمانە باسی شکستی ئەو کەسانە بکەین کە لە ژیانییـان دا سـەرکەتوو و لێهـاتوو بـوون، وەلـێ هەرگیـز شکسـتەکانیان لەبەرچـاو نەگیراوە. ئێمە لەم کتێبە دا پەنجەمان خۆستۆتە سەری بۆ ئەوەی چیرۆکـی ئەو کەسـاییەتییانە بینـە هـەوێنی سـەرکەوتنی زۆرێـك لەوانـەی بـە هـۆی شکســتەکان داڕووخــاون و بەســەرخۆیان داتەپیــوون و لە ژیــان بــێ ئومێدبوون.

ئەمە کـارێکی دیـکەی هاوبەشـی ئـێمەیە بەهیـوای ئەوەی بەردێکـمان خســبێتە ســەربناغەی بونیــاد و توانــای مەعــریفەی تــاکی کــوردیی و سوودێکمان بە خوێنەرانی کتێبخانی کوردی گەیانـدبێت، بە گەورەیتـان لە کەموکوڕییەکان چاوپۆشیمان لێ بکەن.

**نووسەران**

**دڵشاد کاوانی. ڕەوەند سەباح**

**٢٠٢١\٧\٢١**

# (١)

# ژنە ڕاگەیاندنکارە بەناوبانگەکەی جیهان



## ئەریانا هەفینگتۆن (Arianna Huffington)

(کارەکەی ئەریانا هەفینگتۆن لە ٣٦ دەزگای چاپ و پەخش ڕەتکرایەوە)

ئەستەمە باوەڕ بەوە بکەیت، کە یەکێك لە ناسراوترین ئەو کەسانەی لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە کارەکانیان بڵاودەکەنەوە، ئەریانا هەفینگتۆنە. دووەم پەرتووکی هەفینگتۆن، بەر لەم کارە ناوازەی ئێستای، بەرهەمەکەی لە ٣٦ دەزگای چاپ و پەخش ڕەتکرایەوە، دوای هەوڵێکی زۆر دواجار ڕەزامەندی بۆ بڵاوکردنەوە وەرگرت. لە کاتی بڵاوکردنەوەی لەبەر کەموکوڕی کارەکەی، چەندین تێبینی و ڕەخنەی بەرەو ڕووبۆیەوە. بەڵام هەفینگتۆن توانی

بەسەر هەموو ئاستەنگەکان دا زاڵ بێت، ناوی خۆی بکاتە ناوێکی دیار و ناسراو لە دنیای چاپ و پەخشکردن دا.

ئەریانا بە دامەزرێنەر و سەرنووسەری گۆڤاری (هەفینگتۆنپۆست) دادەنرێت. لە ناوەڕاستی نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو بە نووسەرێکی بەناوبانگی (پارێزگاران)[1] دانراوە، دوای ئەوەی لە کۆتایی نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو، بیر و بۆچوونەکانی بە ئاشکرا ئەندازەگەیەنێت، هەرچەند هەفینگتۆن لە کارە بازرگانیکردن بەردەوام بوو، کەچی توانی لە ساڵی ٢٠٠٣ وەك کەسێکی بێلایەن خۆی بۆ پۆستی حاکمی شاری کالیفۆڕنیا کاندید دەکات، وەلێ لە هەڵبژاردنەکان تووشی شکستێکی مەزن دەبێت. پاشان لە ساڵی ٢٠٠٩ لە دەزگای فۆربس بە دوازدەمین کاریگەرترین ئافرەت لە بواری ڕاگەیاندن لە جیهان دادەنرێت. لە گۆڤاری گارڈیان لە نێو سەد کاریگەرترین ژن لە جیهان دا، ئەریانا بە چل و دووەمین ژن لە بواری ڕاگەیاندن دەستنیشان کرا. لە ساڵی ٢٠١٤ لە دەزگای فۆربس بە پەنجا و دووەمین کاریگەرترین ژن لە جیهان هەڵدەبژێردرێت.

ئەریانا بە دزین و لەبەرگرتنەوەی نووسین و لە پەرتووکی (ماریا کالَس، ١٩٨١)، تاوانبار دەکرێت، دواجار کێشەکەی لە دادگا یەکلایکرایەوە. ئەریانا لە ساڵی ١٩٨٥ چاوی بە مایکڵ هەفینگتۆن دەکەوێت، پاش ساڵێك، لە ١٢ نیسانی ١٩٨٦ هاوسەرگیری دەکەن. لەم هاوسەرگیرییەدا دوو کەنیژەیان دەبێت بەناوی ئیزابێلا و کریستینا. ئەریانا هەفینگتۆن لە ڕەچەڵەك یۆنانییە، لە ساڵی ١٩٩٠ ڕەگەزنامەی ئەمریکی بەدەست دێنێت، پاشان بەرەو سانت باربارای کالیفۆڕنیا کۆچ دەکەن. مایکل لە ساڵی ١٩٩٢ وەك کەسێکی کۆماری خۆی بۆ ئەنجومەنی نوێنەران کاندید دەکات، بەمەش سەرکەوتن بەدەست دێنێت. داتر لە ساڵی ١٩٩٤ خۆی بۆ ئەنجومەنی پیران کاندید دەکات، بەڵام ئەمجارە شکست دەخوات. دواجار ئەریانا لە ساڵی ١٩٩٧ لەگەڵ هاوسەرەکەی جیا دەبێتەوە.

---

١- پارتی پارێزگارانی ئەمریکا.

# (٢)

# داهێنەری مایکرۆسۆفت



## بیل گەیتس (Bill Gates)

(یەکەم کۆمپانییای بیل گەیتس هەرەسی هێنا)

بیل گەیتس ئێستا یەکێکە لە دەوڵەمەندترین کەساییەتییەکانی جیهان، ئەمەش کارێکی ئاسان و بێ تەنگ و چەڵەمە نەبووە. ئەو بە ناوی کۆمپانیای تراف ئۆ داتا چووە ناو بواری کاری بازرگانی، بە ئامانجی شیکردنەوە و شرۆڤەکردنی زانیاری شریتی هاتووچۆ. ویستی ئەم بیرۆکەیەی بە هاوبەشی لەگەڵ هاوکارەکەی پۆل ئالن بفرۆشێت، بەڵام کارەکەیان تووشی هەرەسێکی گەورەی کردن. هەرچەندە شکەستەکەیان نەبووە هۆی پاشگەزبوونەوەی بیل بۆ قۆستنەوە و گەڕان بە دوای هەلی کاری دیکە، پاش چەند ساڵێك بەرهەمی مایکرۆسۆفتی هێنایە ئاراوە، بەمەش ڕێگایەکی نوێی لە جیهان داهێنا بۆ سەرکەوتن لە بواری ئایتی دا.

دەسـکەوتی مایکرۆسـۆفت، بیـل لـە کـاری بازرگانیـدا، ڕووبـە ڕووی ئاستەنگێکی گەورەبووەوە. بیل ئەمرۆ لە جیهان بە گەورەترین سەرمایەدار دادەنرێـت. ئەگـەر بیـل گـەیتس خێـزان و بنەماڵەکـەی خۆیـان دەوڵەمەنـدبوون، لـێ هـەرگیز پشـتی بـە سـەرمایەگوزاری بنەماڵەکـەی نەبەستووە. کاری یەکەمی کارێکی هاوبەشبوو لـە نێـوان (پـۆل گیلبێـرت و پۆل ئالن)، بـۆ پەخشـکردنی ڕاپـۆرتی ئامـاریی هـاتووچۆ بـۆ ئەنـدازیارانی هـاتووچۆ، کـارێکی سـەرکەوتوو نـەبوو. ئـەوەبوو لـەکاتی پێشکەشـکردنی زانیارییـەکان بـۆ فەرمانبـەرانی هـاتووچۆی شـاری سـیتڵ، ئامێرەکـەیان پەکیکەوت. بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەم کـارە بیـل و هاوکارەکـانی سـەری کێشا بۆ سەرکەوتنێکی گەورتر لە مایکرۆسۆفت.

ئەوە بزانن بیل لـە کـاری یەکـەمی شکسـتخواردوو بـوو، بـەڵام نـەبووە هۆی ساردبوونەوەی لە هەوڵ و کۆشش. هـەرگیز خـۆی بەدەسـتەوە نەدا، ولـۆ بیرۆکەکـانی هانـدەری بـوون، زۆر بـە زیرەکانـە تـوانی کۆمپانیایـەك دامـەزرێنێت و شۆڕشـێك لـە بـازاری کۆمپیوتـەردا بێنێـتە کـایەوە. کـە هەموومان شایەد و بەکاربەرین لە سەرکەوتنەکە مەزنەکانی دا.

# (٣)

# خاوەنی شکاندنی دوو هەزار و سێ پێوانە

## جۆرج ستینبرێنەر (George Steinbrenner)



(جۆرج ستینبرێنەر بووە هۆی مایەپووچی تیمەکەی)

بەر لەوەی هیچ ناساوێك بەدەست بێنێت، کاتێك بووە خاوەنی یانکیسی نیویۆرك، جۆرج ستینبرێنەر بووبە خاوەنی تیپێکی بچووکی تۆپی سەبەتە بە ناوی کلیڤیلاند پایپەرز لە ساڵی ١٩٦٠. لە ئەنجامی ڕێنمایەهەڵەکانی ستینبرێنەر تەواوی تیپەکەی مایەپوچ بوو.

مۆتەکەی سەرنەکەوتن بەردەوام لە دوای کارەکانی ستینبرێنەر بوو، بە تایبەتی لە ساڵانی حەفتاکان کاتێك کارەکانی یانکیسی گرتە ئەستۆ، ڕووبەڕووی چەندین کێشە و گرفت و زیان بۆەوە، لە ساڵانی ١٩٨٠ و ساڵانی ١٩٩٠. سەرەڕای ئەو ترس و ڕەخنە گشتییەی لەسەر بڕیارە ناکۆکەکانی ستینبرێنەر هەبوو، لە کۆتاییدا توانی تیپەکەی بەرەو سەرکەوتن

ئاراستە بکات، بە شەش جار چوونە ناو زنجیرەی پاڵەوانتییە جیهانییەکان لە نێوان ساڵی ١٩٩٦ و ٢٠٠٣، توانی ڕیکۆردی پڕ قازانجترین تیپی خولی بەیسبۆڵ بەدەست بێنێت.

جۆرج مایکڵ ستینبرێنەر (٤، تەمووز ١٩٣٠- ١٣، تەمووز ٢٠١٠) بزنسمان و بازرگانێکی ئەمەریکی وخاوەنی سەرەکی و هاوبەشی کارگێڕی یەکێتی خولی پاڵەوانی بەیسبۆلی نیۆرکی یانکیس بوو. لە ماوەی ئەو سی و حەوت ساڵەی،کە خاوەندارییەتی یانەکەی کردووە، لە ساڵی ١٩٧٣ تاکوو مردنی لە تەموزی ٢٠١٠، درێژترین ماوە دەبێت، لە مێژووی یانکیس، یانەکە لەم ماوەیەدا حەوت ناسناوی جیهانی بەدەست هێناوە. ڕاشکاویی و کاریگەریی و کاریزمای پێدانی موچەی یاریزانانی پاڵنەرێکی سەرەکی بوون بە پێشخستنی یانەکەی. جۆرج ستینبرێنەر بە کەسایەتییەکی پڕ لە مشتومڕی بواری وەرزشی هەژماردەکرێت.

# (٤)

# داهێنەری وێنەی جووڵاو و فیلمی کارتۆنی

## وۆڵت دیزنی (Walt Disney)



(بە وۆڵت دیزنی گوتراوە، کە ئەو توانای داهێنانی نییە)

ئایا دەزانی یەکێك لە ژیرترین داهێنەرانی سەدەی بیست، لە ڕۆژگارێک دا لە ڕۆژنامەیەکدا دورخراوەتەوە، چونکە پێی گوتراوە، کە ئەو توانای هیچ داهێنانێکی نییە! بەڵام بە هۆی سوربوون لەسەر ئامانجەکانی، دیزنی کۆمپانیایەکی وێنەی جولاو دادەمەزرێنێت، بە ناوی (لەف ئۆ گرام فیلمز). دیزنی توانی پازدە هەزار دۆلار بۆ ئەم کۆمپانیایە گلداتەوە، بەڵام بە هۆی داخرانی، هاوکارێکی دابەشکردنی بەرهەمەکانی، ناچاربوو کۆمپانیاکە لە کۆتایی دابخات.

هەرچەندە دیزنی پەشۆکا و تێکشکا و بێ ئومێد و مایەپوچ بوو، وۆڵت دیزنی ئەمجارە ڕێگای هۆڵی ودی هەڵبژارد، لە وێشەوە تووشی

ڕەخنەیەکی زۆر بۆوە و چەند جارێکی تر هەرەسی هێنا، تاوکو لە کۆتـایی لە ڕێگای چەند فیلمێکـی کلاسـیکی تـوانی ڕێچکـەی خـۆی بگرێتـە بـەر و ناوبانگ بەدەست بێنێت. ئەو پیـاوەی لـە ڕێگـای داهێنانـە کارتۆنییـەکانی کاریگەری لەسەر چەندین نەوە جێهێشتووە، ڕۆژانێـک هەرەسـی هێنـاوە، دیزنی لایەن سەرنووسەری ڕۆژنامەی کەنساس ستی ستار، لە کارەکەی، لـە ساڵی ١٩١٩ دوور دەخرێتەوە، بە هۆی ئەوەی بیرکردنەوەی لاوازە و توانای داهێنـانی نییـە. هەرچەنـدە ئـەو مرۆڤـەی، کـە میکـی مـاوس و چەنـدین کارەکتەری تری بۆ ئێمە هێناوەتە ئاراوە، لەوێ نەوەستا، بەڵکوو دیزنـی لـە کـاره سـەرەتاییەکانی دیزنـی تووشـی مایـەپوچی بـوو، بـەڵام کاتێـك ستۆدیۆیەکی وێنەی جووڵاوی بە ناوی (لەف ئـۆگرام) کـردەوە. کۆمپانیاکـە سەرکەوتنی بەدەستهێنا، چونکە لەو کات، داهێنانـە کارتۆنییـەکانی دیزنـی، ناوبانگێکی زۆریان لە شاری کەنساس بەدەستهێنا. بەڵام کاتێك فەرمانبـەری بەکرێ گرت، نەیتوانی کاروباری دارای بە کارامەیی لە ئەستۆ بگرێت، هـەر بۆیە کۆمپانیاکە کەوتە بـاری قـەرزێکی زۆرەوە. لـە ئەنجامـدا مایـەپووچی خۆی ڕاگەیاند، پاشان ڕووی کردە هۆلیوود لە کالیفۆرنیا.

ئـەو ئاسـتەنگ و هەرەسـانە، نەبوونـە هـۆی ساردبوونەوەی دیزنـی، بەڵکوو وەك هەر کەسێکی تر، ئـەم هەرەسـانە لێـدانێك بـوون لـە خـود و کەسایەتی ئـەو. هـەر کەسـێك تووشـی هـەرەس و مایـەپووچی بووبێـت، دەزانێت هەرەسهێنان و مایەپوچ بوون چەنـد تاڵـە. بـەڵام لەگـەڵ هـەموو ئەوانەشـدا، ئـەم هـەرەس و مایـەپوچ بوونـە، بـەردی بناغـەی پیشـەیەکی سەرکەوتووی دانـا. کـاتێکیش پێکهاتـەی کۆمپانیـای ۆڵـت دیزنـی داڕشـت، هەموو شکستەکانی ڕابردوو ڕێگا خۆشکەربوون، بـۆ کـارێکی سـەرکەوتوو. دیزنی و کۆمپانیای دیزنی چوونـە نـاو دڵـی ملیۆنـان کـەس لەسەرتاسـەری جیهـان، هـەر لـە داهێنانـە کارتۆنییـەکان بگـرە تـاکوو دەگاتـە فیلمـە جووڵاوەکـان، هەنـووکە هـەردوو تـوێژی گـەنج و منـداڵ تـاموچێژ لـە بـەروبوومی کارەکـانی ۆڵـت دەبیـنن. ئەگـەر لـەکاتی هەرەسـهێنان، دەستەوەستان وەستابوایە، هـەموو شـتەکان بـۆ ئەو زۆر جیـاواز دەبـوون، بەڵام ئەو سوربوو لەسەر کارەکەی سەرەڕای هەرەسهێنانی.

# (٥)

# دامەزرێنەری کۆمپانیای ئەپڵ

## ستیڤ جۆبز (Steve Jobs)



(ستیڤ جۆبز لە کۆمپانیاکەی خۆی دوور دەخرێتەوە.)

بـە هـۆی بیرۆکـە مۆدێرنـە بێسـنوورەکانی، هـەروەها هەڵسـانەوە لـە کەوتن و شکستە سارێژکراوەکانی، ستیڤ جۆبز بە یـەکێك لـە سـەرمایەدارە دیارەکان دادەنرێت. ستیڤ لـە بیسـتەکانی تەمـەنی، سـەرکەوتنێکی گەورە بەدەست دێنێت، کاتێك کۆمپانیـای ئـەپڵ دەبێتـە کۆمپانیایـەکی شـاهانەی

زەبەلاح، وەلێ کاتێك تەمەنی دەبێتە ٣٠ساڵ دەستەی بەڕێوەبەری کۆمپانیای ئەپڵ لە کار دووری دەخەنەوە. ستیڤ ملکەچی دۆڕان و کەوتنەکان نەبوو، توانی کۆمپانیایەکی نوێ دابمەزرێنێت، تاکوو لە کۆتاییەکەیدا، کۆمپانیای ئەپڵ بانگهێشتی کردەووە. کاتێك گەڕایەوە کۆمپانیای ئەپڵ، تواناکانی بۆ هەمووان سەلماند. لە ڕێگەی دووبارە داهێنانەوەی وێنای کۆمپانیاکە، ناوی بازرگانی کۆمپانیای ئەپڵی بەرەو لووتکەی داهێنان برد.

ستیڤ پۆڵ جۆبز (٢٤، شوبات ١٩٥٥- ٥، ئۆکتۆبەر ٢٠١١) لە سانفرانسیسکۆ لە دایکبووە، بازرگان و داهێنەرێکی ئەمەریکییە، سەرۆکی دەستەی کارگێڕی و دەستەی بەڕێوەبردن و دامەزرێنەری کۆمپانیای ئەپڵە. بەرلەوەی دەست بکات بە کارکردن لە ئەپڵ، لە ساڵی ١٩٧٦ لەگەڵ ستیڤ وۆزنیاك چەندین کار و پیشەی تری تاقیکردۆتەوە. ئەپڵ ئەو گەورە کۆمپانیایە بوو، لەگەڵ ئامێرەکانی ئایفۆن و ئایپاد و ئایپۆد شۆڕشێکی گەورەی لە بواری تەکنەلۆجیا بەرپاکرد.

لە ساڵی ١٩٨٥ کۆمپانیای ئەپڵ وازدێنێت، پاش دە ساڵ زیاتر دەگەڕێتەوە، لە ساڵی ٢٠١١ بە هۆی نەخۆشی شێرپەنجەی پەنکریاس بەیەکجاری ماڵئاوایی دەکات. دایکی ناوی جۆوان شیبلە و باوکی ناوی عبدالفتاح (جۆن) جندلییە، ئەو دوو قوتابییە بوون لە زانکۆی ویسکۆنسین، بەر لەوەی ناوێك لە کۆرپەکەیان بنێن بۆ بەخێوکردن بەکەسێکییاندا، جەندەلی باوکی لە زانستی سیاسی سووری پرۆفیسۆر بوو، دایکیشی بزیشکی سروشتی ئاخاوتن بوو. دوای ئەوەی بۆ بەخێوکردن درا بە کەسێك، دایك و باوکی ڕستەقینەیی هاوسەرگیریان کرد، منداڵێکیان بوو بەناوی مۆنا سیمپسۆن. تاکوو تەمەنی ٢٧ ساڵی ئینجا توانی زانیاری لەسەر دایك و باوکی ڕاستی بزانێت. دایکە بەخێوکەری ناوی کلارا دەبێت و باویکشی ناوی پۆل جۆبز دەبێت، بۆیە ناوی کۆرپەکە ستیڤ پۆل جۆبز دەنێن، کلارا ژمێریار دەبێت، پۆل جۆبز پاسەوانێکی دێرین و پیشەسازکار دەبێت. خێزانەکەی لە شوێنێکی کالیفۆرنیا ژیان بەسەردەبەن، دواتر ئەو شوێنە بە سلیکۆن ڤالی ناو دەردەکات. لە منداڵیی دا، لەگەڵ باوکی لە

گەراجیماڵەوە زۆرجار لەگەڵ ئامێرە ئەلکترۆنییەکان کات بەسەر دەبەن. پۆل هەموو ئەو کار و پیشانەی پەیوەستن بەکاری ئەلیکترۆنی فێری ستیڤ دەکات، ئەمەش هیوایەك و بڕوایەك لای ستیڤ دروست دەکات لەکردنەوە وت ێکخستن و دروستکردنی ئامێرە ئەلیکترۆنیەکان.

لە کاتێکدا جۆبز بیرمەند و داهێنەرێکی ژیرە، لە خوێندنی فەرمی تەمەنی لاوێتی پڕاوپڕە لە بێ هیوایی و نا ئومێدیی. بە هۆی نیگەرانییەکانی لە بواری خوێندندا، یەکێك بووە، لە قوتابیە سەرکێشەکان، بۆیە مامۆستای پۆلی چوارەمی نارچار دەبێت، بە ڕەشوە و پارە بۆ خوێندن هانی بدات. دەرئەنجامی باش ئەنجامدانی تاقیکردنەوەکانی، کارگێری قوتابخانە پێشنیار دەکات جۆبزبۆ ئامادەیی بگوازرێتەوە، بەڵام ئەم پێشنیارە لای دایك و باوکی ڕەتدەکرێتەوە.

پاش چەند ساڵێك، لە ئامادەیی هۆمستێد چاوی بە ستیڤ وۆزنیاکی هاوبەشی دەکەوێت، حەز و خولیای هەردووکیان لە بواری ئەلیکترۆنیات هانی زیاتریان دەدات تاکوو پێکەوە لەم بوارە کار بکەن و داهێنان ئەنجامبدەن. دوای ئامادەیی ناوی خۆی لە کۆلێژی ڕیید لە پۆرتلاند، لە ویلایەتی ئەریگۆن تۆمار دەکات، بە هۆی ئامادە نەبوونی، دوای شەش مانگ لە کۆلێژ دوور دەکەوێتەوە، نەك هەر ئەمە ١٨ مانگیش لە دووری، وانەکانی داهێنان لە قوتابخانە بەسەردەبات.

جۆبز دەگێرێتەوە و دەڵێت: چۆن بەشداریکردنی خولێك لە خولەکانی خۆشنووسی، حەز و خولیای بۆ چاپکردنی زیاد دەکات. لە ساڵی ١٩٧٤، جۆبز لەگەڵ کۆمپانیای ئەتاری پۆستی دروستکردنی یارییە ڤیدیۆیەکان وەردەگرێت. پاش چەند مانگێك لەو پۆستە دوور دەکەوێتەوە. لە ساڵی ١٩٧٦ لەتەمەنی ٢١ ساڵی لەگەڵ وۆزنیاك دەست بە پڕۆژەی کۆمپیوتەری ئەپڵ دەکەن، لە گەراجی ماڵەوە دەستیان بەکارەکەیان کرد، جۆبز لە ڕێگای فرۆشتنی پاسە ڤۆڵکسوەیگنەکەیەوە و وۆزنیاکیش لە ڕێگەی فرۆشتنی بژمێرە زانستییەکەیەوە خەرجی و کۆمەکی پڕۆژەکەیان دابینکرد.

# (٦)

# دروستکەری بەتامترین شیرینی لە جیهان

## میلتۆن هێرشی (Milton Hershey)



(بەر لە کۆمپانیای هێرشیی بۆ شیرینی، سێ کۆمپانیای تری بۆ شیرینی دامەزراندبوو)

کەم کەس هەیە ئاڵوودەی تامی شیرینی نوقڵ و نەباتەکانی کۆمپانیای هێرشیی نەبووبێت. کەس میلتۆن هێرشی نەدەناسیی، کاتێك دەستی بە پیشەی بەرهەمهێنانی شیرینی کرد. دوای ڕاهێنان لە دەزگایەکی چاپەمەنی دوورخرایەوە، هێرشی دەستی بە سێ پڕۆژەی دامەزراندنی کۆمپانیای جیاوازی بواری شیرنەمەنی کرد. بەڵام بە چاوی خۆی مایەپووچی هەر سێ پڕۆژەکەی دێت. لە دواهەمین هەوڵی دا، کۆمپانیای کارامێلی لانکێستەری

دامەزراند، دەرئەنجامی گەورەی لە بەرهەمەکانیدا هۆنییەوە. دواتر کۆمپانیای هێرشی بۆ شیرنەمەنی دامەزراند، لەم کۆمپانیایەدا، سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێنا، بووە یەکێك لە بەناوبانگترین کۆمپانیا لە پیشەسازی دروستکردنی شیرینیدا.

ئەگەر ئەمجارە تووشی شکستیش ببیت، گرنگ نییە ڕێژەکەی چەند بێت، ئەم چیرۆکانە بۆ ئەو دەبنە هۆی هەوێن. لە هەندێك ساتدا، هەندێك شکست وەك ئەوەی کۆتایی دنیابێت خۆیان دەنووێنن، بەڵام پێویستە ئەوەشت لە بیر بێت، لە دنیای ئەمڕۆ دا ژمارەیەکی بێشومار لە پیاو و ئافرەتی سەرکەوتوو بەسەر سەرکەوتنەکانیان گوزەر دەکەن، چونکە تەنیا لەبەر ئەوەی ڕابردووی تاڵی شکستهێنانیان بەلاوە ناوە و فەرامۆشیان کردووە. بۆیە وانە لە هەڵەکانت وەربگرە، بیربکەرەوە، شکستەکەت قبوڵ بکە، بە مۆراڵتدا بچۆرەوە، بەردەوامبە لە ڕێگەی بەدەستهێنانی ئامانجەکانت بەهەر نرخێك بێت.

# (٧)

# تەنیا یەک نمایشی بە دە ملیۆن دینارە

## جیم کاری (Jim Carrey)

زۆربەمان دەزانین جیم کاری ئەستێرەیەکی درەوشاوەی بەرزە، لە دونیای کۆمیدیا و پێکەنین دا. جیم کاری کەسێکە کە کۆمەڵێك بەرهەمی کۆمیدی و پێکەنین ئامێزی پێشکەشی جیهانی هونەری کۆمیدیا کردووە، گرنگترینی بەرهەمەکانی بریتین لە (زە ماسك، دەم ئاند دەمەر، ئەیس ڤێنچورا)، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو کارە جوانانەشی، ئێمە بێ ئاگاین لە چیرۆکە پڕلە کۆششەکانی کاری.



جیم کاری لە بنەماڵەیەکی هەژار هاتۆتە دونیاوە، هەموو هەوڵەکانی باوکی بریتیبوون لە دەستگرتن بەکارەکانییەوە. هەژاری تەنگی پێهەڵچنیوە و زۆری لێکردووە، لە تەمەنی ١٥ ساڵی واز لە قوتابخانە بێنێت، مل بداتە کار، هەژایی و نەداریی زۆری پێکردووە، بۆ پاڵپشتی کردنی دارایی خێزانەکەی، کاری دەرگاوانی بکات.

لە یەکەم دەرکەوتنیدا، لە یانەیەکدا بەناوی یوك یوك لە تۆرنتۆ، لەسەر تەختی شانۆ گاڵتەجارییەکی زۆری پێکرا. دواتر لە کاتی تاقیکردنەوەدا، بۆ فیلمی (ساتردەی نایت لیڤ) بۆ وەرزی ١٩٨٠-٨١ لە گێڕانی ڕۆڵەکەی سەرکەوتونەبوو. هەرچەندە، شایەتحاڵی سەرکەوتنەکانی جیم کارین، لە یەکێك لە چاوپێکەوتنەکانیدا لەگەڵ ئۆپرا وینفری، باسی چۆنییەتی بەکارهێنانی (لۆ ئۆڤ ئەتراکشن دەکات) بە نووسینی چەکێك بۆ خۆی بە بڕی ١٠،٠٠٠،٠٠٠ دە ملیۆن دۆلار بۆ )ئەکتین سێرفیسس ڕێندەرد)، پاشان چەکەکە بۆ ماوەی ٧ ساڵ لە جزدانی هەڵدەگرێت تاکوو ١٠،٠٠٠،٠٠٠ دۆلار وەك پاداشت لەبەرامبەر کارەکەیدا لە فیلمی (دەم ئاند دەمەر) وەردەگرێت.

# (٨)

# کچە ناسراوەکەی جیهانی گۆرانی

## کاتی پێری (Katy Perry)



زۆرن ئەوانەی گوێبیستی ناسنناوی کاتی پێری بوون، بەڵام کەم کەسیش ئاگاداری هەموو ئەو هەڵکشان و داکشانانەی تێکۆشانەکانی ژیانی ئەون. پێری لە سەرەتاکانی ژیانی دەستی بە ژیانی پیشەیی خۆی کردووە. لە ساڵی ١٩٩٩ وازی لە قوتابخانە هێناوە، بە دوای کاری هونەری گۆرانیگوتن کەوت. لە بنەڕەتدا، گۆرانیبێژێکی ئاینی بووە، ئامۆژگارییەکانی لە دایك و باوکی وەردەگرت کە باوەڕیان بە ئاینی مەسیحی هێنابوو. لەگەڵ ڕێد هیڵ ڕیکۆردز، لە ساڵی ٢٠٠١ یەکەم ئەلبومی گۆرانی ئاینیی بڵاوکردەوە. ئەم کارەی کاتی پێری لە ڕووی بازرگانییەوە شکستی هێنا، دوای ئەوەی تەنیا ٢٠٠ کۆپی لە ئەلبومەکەی فرۆشرا. ئەو کۆمپانیایەی کاری تۆمارکردنی دەکرد، کارەکانی وەستاند. دوای ئەوە، کاتی پێری ڕووی کارەکانی ئاراستەی

مۆسیقای میللی کرد. بۆ ئەنجامدانی کارەکەش بۆ شاری لۆس ئەنجلوس گەشتی کرد، تاکوو لەگەڵ بەرهەمهێن گلێن بالارد کارەکەی تۆمار بکات.لە ساڵی ٢٠٠٣ لەگەڵ (ئایڵەند دێف جام) گرێبەستێکی واژۆکرد، ئەم گرێبەستەش زوو کۆتایی پێهات. دواتر لە ساڵی ٢٠٠٤، لەگەڵ (کۆڵۆمبیا ڕیکۆردز) گریبەستێکی واژۆکرد، بەو مەبەستەی ببێتە گۆرانیبێژێکی سەرەکی لە باندێکی میوزیکی بە ناوی (زە ماتریکس). هەرچەندە، ئەم ڕێککەوتنەش وەك ڕێککەوتنەکانی دیکەی شکستیهێنا، کاتێك (کۆلۆمبیا ڕیکۆردز) لە سەدا هەشتای تەواوی پڕۆژەکەی ڕەتکردەوە.

تۆ بڵێی دوای ئەوەی لە سێ کاری سەرەکی هەرەسی هێنا، پێری واز لە بەدەستهێنانی ئامانجەکانی بێنێت؟ نەخێر! ئەو هەرگیز وازی لە گرتنە ڕێی پیشە و ئامانجەکانی نەهێنا. پێری لە خەونەکانی بەردەوام بوو، تاکوو ساڵی ٢٠٠٦، واژۆی لەگەڵ (گرووپی مۆسیقای کاپیتۆڵ) کرد. لەو وێستگەیەی ژیانی بوو، کاری لەسەر یەکەم کاری هونەری کرد، بەناوی )ئای کیست هێر)، ئەمەش دەنگ و سەدایەکی بازرگانی گەورەی نایەوە.

# (٩)

# بەناوبانگترین پێشکەشکاری جیهان

## ئۆپرا وینفری (Oprah Winfrey)



ئۆپرا وینفری سەرەتای ژیانی بە ناجێگیری دەست پێ دەکات، کچی دایکێکی هەژار و نەداری هەرزەکار بوو، سەرەتای ژیانی هەرگیز خۆشگوزەران نەبووە. ئۆپڕا سەرەتای سالانی تەمەنی دەگێڕێتەوە و ئەو نەك تەنیا باروگوزەرانی ژیانی دژوار و ناخۆش بووە، بەڵکوو چەند جارێك ئامۆزا و مام و هاوڕێیەکانی، لە تەمەنی ٩ سالی، دەستدرێژی سێکسیان

کردۆتەسەر، بۆیە لە تەمەنی ١٤ ساڵی سکی پڕ دەبێت، بەڵام ئەوەندەی پێناچێت،، کۆرپە کورەکەی دوای لەدایکبوونی دەمرێت. سەرەڕای ئەمانەش، ئۆپرا لە تەمەنی ١٤ ساڵی دەچێتە لای باوکی لە ڤێرنۆن تینێسیی. باوکی لە قوتابخانە یارمەتی دەدات، لە ئەنجامدا هەلی تەواوی خوێندن لە زانکۆی تینێسی بە دەست دێنێت. لە ئامادەیی و دوو ساڵی کۆلیژ، ئۆپرا لە وێستەگەیەکی ڕادیۆی خۆجێییدا، خۆی سەرقاڵی کاری ڕاهێنان دەکات. ژیانی وێنفری بە ئاسانی نەچۆتە ڕێوە، هەتا دوای ئەوەی لە وێستگەیەکی خۆجێی تەلەڤزیۆن بۆ هەواڵ خوێندنەوە کاری دەست دەکەوێت. وینفری، لە لایەن بەرهەمهێنی هەواڵەکان، بە هۆکاری نەگونجان بۆ پەخشی هەواڵ خوێندنەوە، دوور دەخرێتەوە. پاشان پێگەیەکی دیکە لە وێستگەیەکی تەلەڤزیۆن لە بەڵتیمۆر دەست دەکەوێت، لە کۆتاییەکەی بەرنامەیەك بەناوی (پیپڵ ئارِ تۆکینگ) پێشکەش دەکات. لە ساڵی ١٩٨٣ لە شیکاگۆ نیشتەجێ دەبێت، بۆ پێشکەشکردنی بەرنامەیەکی ناسراو بە ناوی )ئەی ئێم شیکاگۆ)، لە ماوەی چەند مانگێکی کەم، بەرنامەکەی وێنفری بەرەو لووتکە بەرز دەبێتەوە و پێش بەرنامەیەکی بەناوبانگی وەك (دۆناهیو) دەکەوێتەوە. بە هۆی سەرکەوتنی، بەرنامەکە ناسناوی (ئۆپرا وینفری شۆ) وەردەگرێت و لەسەرتاسەی وڵات بڵاو دەبێتەوە.

# (١٠)

# لێهاتووترین ئاوازدانەر

## جەی زی (Jay-Z)

هەر لەتەمەنی منداڵییەوە جەی زی توانای ئاوازدانانی هەبووە، بەڵام ئەو ناوبانگەی ئێستا هەیەتی، ئەوە ناگەیەنێت، کە جەی زی بە شەو ڕۆژێک بەدەستی هێنابێت. جەی زی بەدەر نەبووە لە ڕووبەڕووبونەوی کۆسپ و بەربەستەکانی ڕێگای سەرکەوتن. بۆ نموونە، کاتێك لە ساڵی ١٩٩٥ هەوڵی بێوچانی تۆمارکردنی بەرهەمەکانی دەدا، هیچ کۆمپانیایەك ئامادەنەبوو، گرێبەستی لەگەڵ واژۆ بکات. ئەمە بووە هۆی ئەوەی بۆ خۆی کۆمپانیایەکی تۆمارکردن بەناوی (ڕۆك ئەی فێلا) لەگەڵ هاوبەشەکانی دامۆن داش و کەریم بیگز دابنێت. دواى ئەوەی لای چەند کۆمپانیایەك ڕەتکرایەوە و جەی زی کۆمپانیای خۆی کردەوە، جەی زی بێ کۆڵدان هەوڵی واژۆکردنی گرێبەستی بڵاوکردنەوەی دابەشکردنی یەکەم ئەلبومی دا. لە کۆتایی دا سەرکەوتوانە گرێبەستێکی لەگەڵ کۆمپانیای (پڕایۆریتی) واژۆکرد.



پاشان یەکەم ئەلبومی خۆی بەناوی (ڕیزنەبڵ داوت) بڵاوکردەوە. جەی زی لە ڕێگای بەدەستهێنانی ئامانجەکانیدا تووشی چەندین شکست بۆوە، ئەو شکستانەش تەنیا لە سەرەتای پیشەکەی نەبووە، بەڵام سەرەتاکان سنوور بۆ ئەو هەموو بەرگرییانە دیاری دەکەن کە بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتنەکانی دەیگرێتەبەر. هەتاکوو لە دەستپێکی پیشەکەیدا تۆمەتبارکرا بە بریندارکردنی کەسێك بە چەقۆ، لە ئاهەنگی نمایشکردنی تۆمارەکانیدا. هەرچەندە، لەم تۆمەتە، دادگا بڕیاری بێتاوانی دەرکرد، بەڵام دواتر بەتاوانێکی سووکتر تۆمەتبارکرا، هەر بۆیە بۆ ماوەی سێ ساڵ خرایە ژێر چاودێری. بەڕەچاوکردنی ئەوەی ڕەگ و ڕیشەی جەی زی لە خانووەکانی برۆکلین، لە شاری نیویۆرك سەرچاوەی گرتووە، بە هەژاری و نەداری گەورەبووە، جەی زی لە ژیانی تووشی چەندین چەرمەسەری و ئاستەنگ بووە، بەڵام هەرگیز دەستبەرداری بەدیهێنانی ئاواتەکانی نەبووە. بۆیە گرنگ نییە چی بەسەرهاتبێت و چ شکستێك یاخە و بەرۆکی گرتبێت، بەناو کێشەکان گوزەری کردووە، کەسایەتییەکی پتە و چالاکی لێ دروستبووە.

# (١١)

# نووسەری ڕۆمانی هاری پۆرتەر

## ج. ك. ڕۆڵینگ (J.K. Rowling)



لەم سەردەمەدا، ڕۆڵینگ پڕ هەوێن بەخشترین چیرۆکەکانی سەرکەوتنە. زۆربەی زۆری خەڵك، تەنیا لەبەر ئەوەی خاوەنی نووسینی هاری پۆتەرە، ئاشنان بە ناو و ناوبانگی ڕۆڵینگن. کەم کەس گوێبیستی چیرۆکە سەرسەخت و مەلەکردنەکانی دەریای سەرکێشی ئەم ئافرەتە، بۆ گەیشتن بە لووتکەی ناوبانگ، ژیانی ڕۆڵینگ سادە و ئاسان نەبووە، بەڵکوو

پڕاوپڕبووە لە ململانێی سەرسەخت. یەکەمجار، لە ساڵی ١٩٩١، بیرۆکەی هاری پۆتەر لە مێشکیدا شکۆفەی کرد. ئەو خۆی دەڵێت، کە تەواوی بیرۆکەی نووسینەکە کاتێك گەشەی کرد، کە لە مانچێستەر بۆ لەندەن بە شەمەندەفەر گەشتی دەکرد. زۆر بە پەرۆشەوە دەستی بە نووسینی کرد، هەرچەندە، ساڵی دواتر، دوای دە ساڵ لە نەخۆشکەوتنی دایکی کۆچی دوایی کرد، بە هۆی کاریگەرییەکانی نەخۆشی ڕەقبوونی ڕیشاڵەکان. لە ساڵی ١٩٩٢ بۆ گوتنەوەی زمانی ئینگلیزی بۆ پرتوگاڵ ڕۆیشت، لەوێندەریش دوای ماوەیەك هاوسەرگیری کرد، لەم هاوسەرگیریەدا کچێکیان بوو. بەڵام لە ساڵی ١٩٩٣ هاوسەرگیرییەکەیان کۆتایی هات، ئەمجارەیان بۆ ئەوەی لە خوشکەکەی نزیکتر بکەوێتەوە، بەرەو ئێدینبرە، سکۆتلەندا، گەشتی کرد. ئەو کات، تەنیا سێ بەش لە هاری پۆتەر لەناو هەگبەی دا هەبوون.

ڕۆڵینگ وەك کەسێکی شکستخواردوو، خۆی دەهاتە بەرچاو، چونکە ئافرەتێکی بێکار، مایەپوچ، تەڵاقدراو، خاوەن منداڵێك بوو. هەر بۆیە کەوتە ژێر کاریگەری چەند شەپۆلێك خەمۆکی، لە کۆتایەکەی دا، ناوی خۆی بۆ بیمەی بێکاری کۆمەڵایەتی حکومەت تۆمارکرد، ئەو سەردەمە تابڵیی کاتێکی دژوار و سەخت بوو بۆ ڕۆڵینگ، بەڵام ئەو ئەسپی خۆی بەناو ئاگری بەربەستەکان تاودا و سوارچاکێکی چاکی لێ دەرچوو.

لە ساڵی ١٩٩٥، ١٢ دەزگای چاپەمەنیی، دەستنووسی ڕۆمانی هاری پۆتەریان ڕەتکردەوە. بەڵام هەمان ساڵ تەنیا، چاپخانەیەکی بچووکی وەك بلومزبێری، بە پێشینەی ١٥٠٠ پاوەند، کارەکەی قبوول کرد. لە ساڵی ١٩٩٧، تەنیا ١٠٠٠ دانەی لێ لە چاپدرا، ٥٠٠ دانەی بەسەر کتێبخانەکان بڵاوکرایەوە. (لە ساڵی ١٩٩٧ و ١٩٩٨ هارپۆتەر خەڵاتی ) نێستڵ سمارتیز بوك و بریتیش بوك ئەوێرد)ی بۆ پەرتوکی منداڵان بەدەستهێنا. ئەمەش هەنگاوێکی گەورەو زەبەلاح بوو. ئێستا ڕۆڵینگ ٤٠٠ ملیۆن دانەی لە ڕۆمانەکەی فرۆشتووە، بەسەرکەوتووترین ژنەنووسەر دادەنرێت، لە شانشینی یەکگرتووی بەریتانیا دا. ڕۆڵینگ دەڵێت: شکست واتا هەڵوەرینی شتە بێ بەهاکان.

# (١٢)

# نووسەری پڕ فرۆشترین ڕۆمان



## ستیڤن کینگ

## (Stephen King)

بە هۆی ڕۆمانە نایابەکانی، ستیڤن کینگ خاوەن ناسناوێکی گەورەیە. زۆربەی زۆری ڕۆمانەکانی کراونەتە فیلم. هەرچەندە یەکەم ڕۆمانی ستیڤن کینگ بەناوی (کاریی) بەرلەوەی لە چاپ بدرێت، ٣٠ جار ڕەتکرایەوە. نەك تەنیا ئەمە، بەڵکوو ستیڤ دەستنووسی بەرهەمەکەی خستە ناو زبڵدانەوە، هەرچەندە خێزانەکەی، دواتر توانی ستیڤ هێور بکاتەوە و بیهێنێتەوە دۆخی پێشوو، چونکە ئەو باوەڕی تەواوی هەبوو، کە ستیڤ ڕۆژانێک نووسەرێکی بلیمەت و بە توانای لێ دەردەچێت. لەگەڵ ئەوەشدا، سەرەتاکانی ژیانی ستیڤن بێ خەرمانن. وەك منداڵیك، خێزانەکەی زۆر بە ئەستەم و بەکولەمەرگی و

نەهامــەتی دەژیــان، پاشــان، وەك مامۆســتایەکی زمــانی ئینگلیــزی، بــۆ دابینکردنی بژێوی ژیانی خێزانەکەی، کورتە چیرۆکی دەفرۆشتە گۆڤارەکان.

ئێستا ستیڤن کینگ خـاوەن ٥٠ ڕۆمانـە، زیـاتر لـە ٣٥٠ ملیـۆن دانـەی لـە بەرهەمەکانی فرۆشتووە. بیربکـەوە، ئەگـەر سـتیڤن کینـگ دەسـتبەرداری خەونەکانی بوایە، ئێستا ژیانی چۆن دەبـوو؟ مەحاڵـە بـاوەڕ بـەوە بکـەیت، نووسەرێکی بەم شێوەیە سەرکەوتوو، سی کەرەت کارەکـەی ڕەتکرابێتـەوە. هەموو ئەو شکستانەی ستیڤن کینگ بوونە هەوێنی سەرکەوتنی لە دونیای ئەدەب دا.

# (١٣)

# دامەزرێنەری ئۆتۆمبێلی فۆرد

## هێنری فۆرد (Henry Ford).



زۆرینەی خەڵك، بە هۆی کۆمپانیای فۆرد بۆ ئۆتۆمۆبێل، وەك یەکێك لە سەرکەوتووترین کۆمپانیاکانی بەرهەمهێنانی ئۆتۆمۆبێل، بە ناوی فۆرد ئاشنان. بەڵام بێ ئاگان، لەوەی کە هێنری، بەر لەوەی ئاوێتەی سەرکەوتنەکانی کۆمپانیاکەی ببێت، پێشتر دوو جار شکستی خواردووە، بەخێرایی تووشی مایەپوچ بوونێکی زۆر بۆتەوە. فۆرد بە شکستهێنان نامۆ نییە، لەگەڵ ئەوەش هەرگیز خۆی بە دەستەوە نەداوە. کاتێك بیر لە فۆرد

دەکەینەوە، هەرگیز وێنای شکستەکانی ناکەین، چونکە ئێستا لە لووتکەی سەرکەوتن دایە. هەرچەندە لە ساڵی ١٨٩٩، لەتەمەنی ٣٦ ساڵی یەکەم کۆمپانیای خۆی بە ناوی (دیترۆیت ئۆتۆمۆبیل) دامەزراند، ئەو کۆمپانیایەش بە پاڵپشتی کەسایەتی ناسراو، ولیام مێرفی بوو، ئەوەندەی پێنەچوو، کۆمپانیاکە شکستی هێنا و مایەپوچ بوو.

هەوڵی دووەمی هێنری فۆرد بریتی بوو، لە دامەزراندنی کۆمپانیای فۆرد لە ساڵی ١٩٠١. ئەو کۆمپانیایە دواتر بۆ کۆمپانیای (کادیلاك ئۆتۆمۆبیل) ناوی گۆڕدرا، ئەمەش سێیەم هەوڵی فۆرد بوو، لەگەڵ کۆمپانیای (فۆرد مۆتۆڕ)، لێرەدا ئەم کۆمپانیایە وەك سومبولی سەرکەوتن مایەوە.

دوای ئەوە، فۆرد شۆڕشێکی لە پیشەسازی دروستکردنی ئۆتۆمۆبێل دا بەرپا کرد، فۆرد تەنیا پێشەنگ نەبوو لە داهێنانی مۆدێلی (T) و کۆکردنەوەی پێکهاتەکانی، بەڵکوو پێشەنگ بوو لە داهێنانی چەمك و بیری هەبوونی ئۆتۆمۆبیل لە هەموو ماڵێك. ئەمەش وای کرد لێخورین ببێتە بابەتێك و چەمکێك، لە ئەنجامدا فۆرد توانی لە جۆری (مۆدێڵ T) ١٧ ملیۆن دانە بفرۆشێت. ئەوەیە هێنری فۆرد بەر لە دامەزراندنی کۆمپانیای (فۆرد مۆتۆڕ)، لە سەرەتای کارکردنیدا پێنج جار تووشی شکستهینان بووە، بەڵام باوەڕبەخۆبوون، لە ناخیدا چەکەرەی کرد، تا لە ئەنجامدا دارێکی پڕ لە بەرووبومی لێهاتە بەرهەم.

# (١٤)

# چێشتلێنەری کینتاکی

## کۆڵۆنێڵ ساندەرز

## (Colonel Sanders)



جیهان بە هۆی چاکەتە دیار و سپی و بۆینباغە چەماوەکەیەوە کۆڵۆنێڵ ساندەرز دەناسن. کۆڵۆنێل بە دامەزرێنەری مریشکی سورکراوەی کێنتاکی (کێنتاکی فرایەد چیکن)[١] دادەنرێت. لەگەڵ ئەوەشدا، ساندەرزی سەرکێش سەرەتای ژیانی بە لەرزۆکی دەست پێ دەکات، لە تەمەنی ٦٢ ساڵی بە چەکێکی ١٠٥ دۆلاری دەست بە ناردنی شێوازی سوورکرنەوەی مریشکە برژاوەکانی، بۆ چێشتخانەکان دەکات. هەرچەندە خەڵك بە شێت و سەرلێشێواوی لە قەڵەم دەدا، بەڵام ئەو هەرگیز دەستبەرداری خەونەکانی نەدەبوو.

---

١ -(Kentucky Fried Chicken: KFC).

ساندەرز چەندەها کار و پیشەی تاقیکردۆتەوە، لەوانە ئاگرکوژاندنـەوە و تایە فرۆشیی و بریکاریی و چێشتلێنان. لە نێوان ساڵی ١٩٣٩ و ١٩٤٠. لـە تەمەنی ٥٠ سـاڵی دابـوو، کاتێـك شـێوازی نـوێ و نهێنیـی سـوورکردنەوەی مریشکی داهێنا. هەرچەند تـا سـاڵی ١٩٥٢ نـەیتوانی سـەرکەوتووبێت، لـە فرۆشتنی بەروبوومەکـەی بـە چێشـتخانەکان. یەکـەم چێشـتخانە، کـە ئـەو کاری تێدا کرد، مریشکی کێنتاکی تێدا فرۆشت، بریتی بوو لـە چێشـتخانەی سۆڵت لە یك ستی، لە ئۆتاە. لە ماوەی ساڵێکدا، چێشتخانەکە سێ ئەوەندە فرۆشتنی زیـادکرد، لـە سـەدا حـەفتا و پێنجـی داهاتەکەشـی لـە مریشـکی کێنتـاکی بەدەسـت کـەوت.کۆمپانیاکـە گەشـەی سـەند و زۆر بـە خێـرای پێشکەوت لەوەی کە ئەو پێشبینی دەکرد.

لە ساڵی ١٩٦٤، لە تەمەنی ٧٤ ساڵیدا، ساندەرز کۆمپانیاکەی بـە بـڕی ٢ ملیۆن دۆلار بە کۆمەڵێك وەبەرهێن فرۆشـت، کـە لای جـاك سـی ماسـی و جۆن وای براون بەڕێوەدەچوو. بەڵام لەگەڵ ئەوانەشـدا، وەك نێـردەی نیـاز پاکی کۆمپانیاکە مایەوە. لێرەدا، وانەیەك فێردەبین، ئەویش ئەوەیە: بـۆ بـە دەستهێنانی ئاوات و ئامانجـەکان، تەمـەن گرنـگ نییـە هـەروەها مـەرجی نییە، بۆ گەیشتن بە مەرامی گەورە، پارەیەکی خەیاڵی و زۆرت لە هەگبـەدا هەبێت.

# (١٥)

# ڕووناککەرەوەی جیهان



## تۆماس ئەدیسۆن
## (Tomas Edison)

کەم کەس هەیە، گوێچکەکانی بە ناوی ئەدیسۆن نەزرنگا بێت، ئەم پیاوە ئەمریکییە بەناوبانگە، بە داهێنانی ڕووناککەرەوەی کارەبایی ناسراوە. تۆماس ئەلڤا ئەدیسۆن، لە ١١ی فێبریوەری ساڵی ١٨٤٧ لە شەوێکی ساردوبەفراوی و سەختدا، لەشاری میلان، ئۆهیۆ لە دایکبووە. دایکی ناوی نانسی و باوکی ناوی سامیول بوو بۆیە کورەکەیان ناوی تۆماسی لی دەنێن، بەناوی مامەگەورەکەی دەکەنەوە. ناوی ئەلڤا(ش) بەناوی کاپتن ئەلڤا برادلی، کە هاوڕێیەکی دڵسۆزی باوکی بوو. خێزانەکەی ئەدیسۆنیان بە ناوی ئاڵ بانگ دەکرد.

(ئاڵی) بچووك، دەیویست هەموو شتێك لەدەوروبەری خۆی بدۆزێتەوە. ئەو وەك زانایەك بۆ تاقیکردنەوەی شتەکان هەنگاوی دەنا. نەك تەنیا پرسیاری دەکرد، بەڵکوو هەوڵی دەدا بۆخۆی وەڵامەکان بدۆزێتەوە.«

زیاتر لە ١٠،٠٠٠ دە هەزار جار شکستی هێناوە، بەڵام هەرگیز سەری دانەنواندوە بۆ شکستەکان. کاتێك ڕۆژنامەنووسێك پرسیاری لێکرد: ئاخۆ دوای ئەوەی ١٠،٠٠٠ دە هەزار جار تاقیکردنەوە و هەست بە شکست کردن، چۆن دەبێت، واز لەم کارە نەهێنیت. ئەدیسۆن زۆر بە سادەیی وەڵامی دایەوە و گوتی: بۆچی دەبێت هەست بە شکست بکەم؟ پاشان بۆ دەبێت واز لەم کارە بێنم؟ چونکە ئێستا دڵنیام لەوەی زیاتر لە ٩٠٠٠ نۆ هەزار ڕێگا هەیە، کە ڕووناکەرەوەی کارەبایی کار ناکات. سەرکەوتن زۆر نزیکە وا لەناو لەپی دەستەکانم دایە. ئەدیسۆن هەمان ئەو کەسەیە کە مامۆستاکان پێیان گوت: زۆر گەمژەیە و هیچ شتێك فێرنابێت. جگە لەمانە ئەدیسۆن دووجار لە کار و پیشەی خۆی دوورخراوەتەوە، بە هۆکاری ئەوەی کەسێکی بێ بەرهەمە. بە جۆرێك دەڵێن لە سەرەتای کاتەکانی ژیانیدا، ئەدیسۆن هۆکاری سەرکەوتنەکانی بۆ دایکی دەگەڕێنێتەوە، دایکی لە قوتابخانە دەری دەهێنێت و خۆی وانەی پێدەڵێت. دایکی زۆر بە قووڵی باوەڕی پێی هەبووە، ئەویش نەیویستوە دایکی بێ ئومێد بکات. حەزە سەرەتاییەکان بۆ تاقیکردنەوە کیمیاییەکان و ئەندازەی میکانیکی، ڕێخۆشکەربوون، بۆ داهاتوویەکی پڕشنگدار و سەرسوڕهێنەر. کۆمپانیاکەی بەناوی (GE) تا ئێستاش بە گەورەترین کۆمپانیای بازرگانی لە حیهان دادەنرێت.

ڕۆژێکیان بنەماڵەی ئەدیسۆن نەیانتوانی ئاڵی تەمەن شەش ساڵ بدۆزنەوە، ئاڵ ئەو ناوە بوو، کە خێزانەکەی پێیاندەگوت. ئەوان سەردانی خوشکە گەورەکەی ئاڵ و هاوسەرەکەیان لە کێڵگە دەکرد. ماڵییان لە دەرەوەی شاری میلان و نزیك ئۆهیۆ بوو. ساڵی ١٨٥٣، لەناکاو مامی ئاڵ بیرۆکەیەکی بۆ هات. ڕایکرد بۆ تەویڵەکە، لەوێ ئاڵی دیت. ئاڵ هەوڵی شکاندنی هێلکە قازێکی دەدا، ئاڵ سەیری ئەو مریشکەی دەکرد، کە لەسەرهێلکەکانی کڕکەوتبوو، بێچووەکان هێلکەکەیان دەتروکاند و

دەهاتنە دەرەوە. ئاڵ دەیویست بێچووە قازێک لە هێلکەی مریشکەکە هەڵبێت، کە جووجەڵەکە لە هێلکە دێتە دەرەوە. بنەماڵەی ئەدیسۆ بەمە سەرسام نەبوون. ئەوان سێ منداڵی تریان هەبوو، بەڵام بچووکترین منداڵیان (ئاڵ) لە هەموویان زیاتر حەزی بە زانین دەکرد. ئەوبەم شێوەیە دەبێت بە درێژای ژیانی. زەو کاتە جیهان زۆر جیاواز بوو، کاتێك تۆماس ئەڵڤا ئەدیسۆن منداڵ بوو. لە سەردەمی ئەو هیچ چرایەکی کارەبایی نەبوو بۆ بینین، هیچ تۆمارێکی مۆسیقی نەبوو بۆ گوێگرتن، هیچ فیلمێکی سینەمایی نەبوو بۆ سەیرکردن. ئەوە ئەدیسۆن بوو، ئەمانەی هێنا کایەوە، زیاد لەوەش، ژیانی ئێمەی تاهەتایە گۆڕی.

جارێکیان ئاڵ شانەی مێش هەنگوینی تێکدەدا بۆ ئەوەی بزانێت ناو شانەکە چی تێدایە، هەندێکجاریش سەیری باڵندەی دەکرد کە چۆن کرم دەخوات و دەفڕێت. هەروەها ئاڵ کرمەکانی دە پڵیشاندنەوە و لەگەڵ ئاو تێکەڵی دەکرد و دەیدا بە کچە دراوسێیەکی، یان ئاڵ لقی دار ئەسپیندارەکانی دەلێستەوە. هیچ شتێك ئاڵی نەدەوەستاند، نە مێشەنگێنەکان، نە لێسینەوەی دار، نەکەوتنە خوارەوەی بۆ ناو سایلۆی دانەوێڵە. لەسەر لێواری سایلۆی دانەوێلە پیاسەی دەکرد، کاتێك کەوتە خوارەوە. خۆشبەختانە کەسێك بە هۆی قاچەکانییەوە ڕایکێشا و ڕزگاری کرد، بەرلەوەی بەتەواوی بکەوێتە ژێر گەنمەکە.

باوکی ئاڵ خاوەنی کێڵگەیەکی بچووکی دانەوێڵە و ئامێری هاڕین و پارچەکردنی دار بوو، لە میلان. بەلەمەکانی کاپتن ئەڵڤا برادلی دارەکانیان دەگواستەوە، لە کەنەداوە بۆ دەریاچەی ئیریك و ڕووباری هورۆن دەگواستەوە پاشان بەناو نۆکەند و ڕێڕەوە ئاویەکانی میلان. لەوێندەر دار و تەختە دەبردران لە کارگەکەیەك پارچە دەکران، وەك ئەوەی هی مستەر ئەدیسۆن. ئۆتۆمۆبێل و بارهەڵگر تا ئێستا دروست نەکرابوون، شەمەندەفەریش نەگەیشتبووە میلان. بەڵام کاتێك هێڵی شەمەندەفەر دروستکرا. دەنگی شەمەندەفەر لە شاردا بیسترا، نۆکەندەکە هیچیتر بایەخی نەما. هێڵی شەمەندەفەر خێراتر و ئاسانتربوون بۆ گواستنەوەی کەلوپەل لە وڵات. پاشان، کە ئاڵ تەمەنی گەیشتە حەوت ساڵان، خێزانەکەی بڕیاریاندا ماڵی خۆیان بگوازنەوە پۆرت هورۆن، لە مێشیگان،

زیاتر لە سەد میل لە باکووری میلان دووربوو.لە ناو خانوویـەکـی گـەورەدا دەژیان، لەسەر ڕوباری سەینت کلێر، بۆ بژێـوی ژیانیـان، بـاوکی ئـاڵ کـاری جۆراوجۆری دەکرد، وەك دارتاشی و سەوزەفرشی، هـەروەها کشتوکالیشـی دەکرد.

بـاوکی ئـاڵ تـاوەرێکی سـەد پـێ بـەرزی دروسـتکرد، کـە بـە سـەر ڕووبارەکـەی دەڕوانـی، هەرکەسێك دەیتـوانی بـە بیسـت و پێـنج سـەنت بەسەر بکەوێت و سەیری ڕۆیشتنی بەلەمەکان بکات. بنەماڵەی ئەدیسـۆن بۆماوەیەکی کەم لەم شوێنە مانەوە، چونکە ئاڵ تووشی نەخۆشی سـوورەتا بوو. پەتایەکی ترسـناك بـوو، لەبەر بـەکارهێنانی داودەرمـان ئـاڵ تایەکـەی بـەرز بـووەوە پێسـتی سـوور هەڵگـەڕا، هەرچەنـدا، ئـاڵ باشـتربووبوو، بـەڵام هەستی کرد، وەك پێشان ناتوانێت ببیسـتێت، ئـەکرێت، ئەمـەش بـە هـۆی سوورەتاوە بوبێت.

لـە قوتابخانـەش مامۆسـتاکەی، گلـەیی لـە ئـاڵ دەکـرد، کـە ئـاڵ بـاش سەرنجی نەدەدا خوێنـدن. ئـاڵ خـەوی لـێ دەکـەوت چ بـە هـۆی بێـزاری بووبێت یان نەبیستنی وانەکان. ڕۆژێکیـان ئـاڵ گـوێی لێبـوو مامۆسـتاکەی دەیگوت ئەو (ئاڵ) بۆگەن بووە، واتا مێشکی ئاڵ بۆگـەن و گەنـدەڵ بـووە. کاتێـك ئـاڵ ئەمـە ی بـۆ دایکـی گێڕایـەوە، دایکـی زۆر توڕەبـوو، ئـاڵی لـە قوتابخانە دەرهێنا، لە ماڵەوە وانەیان پێدەگوت.

ئاڵ حەزی لە خوێندنەوەبوو. مامۆستاکەی سەرسام بـوو، کاتێـك دەیـدیت، ئـاڵ ئـەو پەرتوکـە زەحمەتانـە دەخوێنێتـەوە کـە دایکـی پێیـدەدا. ئـەو پەرتوکانەی ئەو دەیخوێندەوە دەربارەی مێـژوو و سروشـت و زانسـتبوون. زۆر بە خێرایی دەیخوێندنەوە. یەکێك لە پەرتووکەکانی زۆر پێ پەسـندبوو بـەناوی « پـوختەیەکی فێرگەیـی تـایبەت بە فەلسـەفەی سروشـتیی و ئەزمونی»[1] پەرتوکێکی زانستی بوو، باسی کارەبا و پـاتری و یـاری کارەبـایی دەکـرد. پەرتوکەکـە، چەنـد تاقیکردنەوەیـەکی سـادەی تێـدابوو. ئـاڵ زۆر دڵخۆشـبوو بـەوەی، تاقیکردنـەوەکانی لـە هـەموو ماڵـەوە دەکـرد. ئـەو

[1] - School Compendium of natural Philosophy.

کەلوپەلانەی بەکاری دەهێنان بریتیبوون لە پەڕامووچ و مۆمی مێش هەنگوێن و مادده کیمییایەکانی دەرمانخانە، ژوری نوستنەکەی بڕ بوو بە بوتڵ و شوشە و بەرداخ. لە کۆتایی دا، دایکی ناردییە ژێرزەمینەکە، بۆ ئەوەی لەوێ تاقیگاکەی خۆی دروستب کات.

ئەدیسۆن زۆر باوەڕی بە داهێنان هەبوو، باوەڕی بەو داهێنانانە هەبوو، کە ژیانی هەموو کەسێك ئاسان و ئاسوودە دەکات. لە ڕێگای ئەم داهێنانەی کە ئەنجامیدا. تۆماس ئەلڤا ئەدیسۆن، ئستا بە مەزنترین داهێنەری مرۆڤایەتی دادەنرێت.

# (١٦)



## داهێنەری نامەی ئەلیکترۆنی (تێلگرام)

**مۆرس کۆد**

**(١٧٩- ١٨٧٢.ز)**

ساميول مۆرس لە چارلستۆن، ماساچوسيتيس لە دايكبووە. نيوەی ژيانی بۆ وێنەكيشان تەرخان كردووە. مۆرس هەميشە حەزی لە كاری زانستيی بوو، بەتايبەتی زانستی كارەبايی. لە تەمەنی چل ويەك ساڵی بيرۆكەيەكی بۆ هات، كە بريتی بوو لە ناردنی پەيام بەشێوەی كۆد لە ڕێگای تەل. كاتێك لەسەر كەشتی بوو لە فەڕەنساوە دەگەڕايەوە ماڵەوە، ئەو بيرۆكەيەی بۆ هات، نزێكەی يەك مانگی خاياند تا كوو لە ئەمەريكاوە پيتێكی پێ دەگەيشت.

ئەو ئامێرە سادەيەی لە ساڵی ١٨٣٧ بۆ يەكەم جار كاری تێداكرد و دروستی كرد، لە ساڵی ١٨٤٤ توانی يەكەم پەيامی فەرمی تێليگرامی پێ بنێرێت. مۆرس بە لێدانی ئەو وشانە لە كتێبی پيرۆزەوە «خودا چی دروست كردوە؟»[1] لە واشنتۆنەوە بۆ باڵتيمۆر و ماريلاند، كە سی و چوار ميل دوور ئەو وشانەی نارد، كەمتر لەيەك چركەی خاياند، تاكوو لە ڕێگای تەلەكەوە بڵاوبێتەوە. بەشێك لەو پەرتووكەی كە ئاڵ زۆر حەزی لێ بوو ئەلفوبێی

[1] - WHAT HATH GOD WROUGHT?.

تەلەگرافی مۆرس بوو، مۆرس ناوی کۆدێك بوو. ئەو کۆدە پەیامی لە ڕێگای تەلی تەلەگرافییەوە دەنارد. ئەو کات تەلەفۆن نەبوو. نەدەتوانرا لە گەڵ کەسێك لە شوێنێکی دوور قسە بکەیت، بەڵام دەتوانرا پەیام بنێریت بەخێرای پێی بگات.

سامیول مۆرس ئەو کۆدەی دروست کرد، لە جیاتی بەکارهێنانی پیت و ژمارە، خاڵ و هێڵی بۆ ناردنی پەیامەکان بە کاردەهێنا، کە بە تێلیگرام ناسراوە. هێڵی شەمەندەفەر ڕۆڵێکی کاریگەری هەبوو، چونکە ئەو تەلە تەلەگرافیيانەی تەلەگرامییان دەگواستەوە بەدرێژای هێڵەکانی شەمەندەفەر. بەگەڕخەرەکان، لە وێستگەی شەمەندەفەر لە دارئەلەتریک[1] بەسترابوونەوە، دەیانتوانی پێشتر پەیام بنێرن ئەگەر خشتەکان گۆڕانکارییان بەسەرداهاتبووایە، یان ئەگەر ڕووداوێك یان دواخستنێك لە ئارادابووایە. بۆیە تەلەگراف کاری شەمەندەفەری سەلامەترکرد.

بەگەڕخەرێك پەیامەکەی بەشێوەی خاڵ و هێڵ، لە ڕێگای کلیلێکی کانزایی لەسەر بۆڕدێکەوە دەنارد. پەیامەکە لە ڕێگەی تەلێکەوە لەشێوەی شەپۆلی کارەبایی بۆ وێستگەی دیکە دەڕۆیشت. پاشان خاڵ و هێڵەکان لەسەر کاغەزێکی لوول دراوەوە دەنووسران. دواتر بەگەڕخەر، پەیامەکەی بە هۆی کۆدی مۆرس شیدەکردەوە، بەشێوەی وشە دەینووسیەوە. تەڵەگرام گرانبەهابوو، زۆربەی جار خاوەنکارەکان بەکاریان دەهێنا، هەرچەندە خەڵکی ئاسایش بەکاریدەهێنا، بۆ پەیوەندیکردن بە خێزان و هاوڕێکانییان، یان گەیاندنی هەواڵی خێرا، وەك لەدایکبوونی منداڵ.

ئاڵ چاوەڕوانی ئەوەنەبوو تاکوو ئەمە تاقی بکاتەوە. ئەو خۆی ئامێرێکی تەلەگرافی سادەی دروستکرد و خۆی فێری کۆدی مۆرس کرد. جگە لەمە، توانی نێوان ماڵی خۆی و هاوڕێ نزیکەکانی بە تەلێکەوە ببەستێتەوە. کاتێك فێری کۆدی مۆرس بوون، پەیامییان بۆ یەکتری دەنارد. ئەوەندەی پێنەچوو، ئاڵ کارێکی لە هێڵی شەمەندەفەر بۆ خۆی دۆزییەوە، بەم شێوەیە حەز و خولیاکانی لە کاری تەلەگرافی زۆر زیاتر گەشەی کرد.

---

[1] - **دارئەلەتریک:** عامودی کارەبا، یان داری ڕۆناککەرەوە.

# (١٧)

# داهێنەری باشترین گیسکی کارەبایی



### سیر جەیمس دایسۆن
### (Sir James Dyson)

گسکی کارەبایی دایسن، لەسەرتاسەری جیهان بەوە ناسراوە، کە هەرگیز پەکی ناکەوێت. ئەم بیرۆکەیە زۆر لەمێژە لە دایکبووە، بەڵام دایسۆن بۆ یەکەم جار لە سییەکانی تەمەنی تاقی کردەوە، کاتێك بێ هیوابوو، لە تاقیکردنەوەی گسکی کارەبای هوڤەر بە هۆی ڕاکێشانە بێهێزەکەی. ئەو کات، بازاری گۆڕینی کیسە بەکارنەهاتووەکانی گسکی کارەبای بە بەهای نزیکەی ١٠٠ ملیۆن پاوەند بۆ هەر ساڵێك دەخەملێنرا، هەر بۆیە ئەم بیرۆکەیەی داهێنا، کە یەکەم گیسکی کارەبای بێ کیسە لە جیهان دروست بکات.

دایسۆن ٥،١٢٦ هەزارجار لە تاقیکردنەوەی بەکارهێنانی ئـەم بیرۆکەیـە شکسـتی هێنـا. کـاتێکیش لـە تەمـەنی ٣٦ سـاڵی تاقیکردنەوەکـەی بـە سەرکەوتوویی ئەنجامدا، تووشی بەربەستێکی دیکە بۆەوە، بە هۆی ئەوەی هـیچ کۆمپانیایـەکی دابەشـکردن، لـە شانشـینی یـەکگرتووی بەریتانیـا ئامادەنــەبوو، بەرهەمەکــەی دابــەش بکــات. هــیچ کۆمپانیایــەك ئــەم بەرپرسیاریەتییەی نەگرتە ئەستۆ. بۆیە دایسۆن لـە سـاڵی ١٩٨٣ ڕوویکـردە بازاڕەکـانی ژاپـۆن، تـوانی لـە سـاڵی ١٩٨٦ خـەڵاتی پیشەسـازی لـە ژاپـۆن بەدەستبێنێت. دوای سێ ساڵ، یەکـەم خـەڵاتی داهێنـانی لـە ویلایـەتەیـە کگرتوەکانی ئەمـەریکا بەدەسـتهێنا. لەگـەڵ ئەوەشـدا، بەرهەمهێنـەرەکان، ئێسـتاش نەیاندەویسـت، بەرهەمەکـەی بـۆ کۆمپانیـای دیکـە ببـەن. بۆیـە دایسۆ، لە ساڵی ١٩٩٣، لەتەمەنی ٤٦ ساڵی بۆ بە بازارکردنی بەرهەمەکانی، کۆمپانیای خۆی دامەزراند. ئـەمڕۆ بـەهای کۆمپانیـای دایسـۆن سـێ مليـار پاوەندە، ئەمەش هەموو بـۆ ئـەوە دەگەڕێتـەوە، کـە هـەرگیز خەونـەکانی خـۆی بەدەسـتەوەنەدا. دژی هــەموو شکســت و غــەم و پەشـیمانی و کۆسپەکان شەڕیکرد، تاگەیشتە لووتکەی خەونەکانی.

# (١٨)

# دامەزرێنەری کۆمپانیای هۆندا

## سۆیچیرۆ هۆندا (Soichiro Honda)




( ١٧ی نۆڤێمبەری ١٩٠٦- ٥ی ئۆگەستی ١٩٩٠).

ئەندازیارێکی ژاپۆنییە لە ساڵی ١٩٤٨ کۆمپانیای هۆندای دامەزراندووە. لە سەرەتای ژیانییدا حەز و خولیای بۆ خوێندنێکی کلاسیکی نەبووە. لە قوتابخانە نمرەکان بە قوتابییەکان دەدرانەوە بۆئەوەی بیبەنە ماڵەوە و نیشانی خێزانەکانیان بدەن و مۆر و واژۆی خانەوادەی پێوەبێت، تاکوو بزانرێت لە ماڵەوە تەماشایان ئەنجامەکانیان کردووە. بەڵام سۆیچیرۆ مۆر و واژۆی ساختەی لە پەیدانی پایسکلەکەی دروستکرد. سۆیچرۆ هەر لە تەمەنی منداڵیەوە ئارەزوی کاروباری پیشەسازی کردووە، کاتێك بۆیەکەم جار ئۆتۆمبێلێك لە لادێیەکەیان تێ دەپەڕێت زۆر دڵخۆش دەبێت و سەرسام و مەست دەبێت بە بۆنی سوتەمەنی ئۆتۆمبێلەکە. لە تەمەنی ١٥ ساڵی بەبێ ئەوەی

خوێندنی تەواو بکات، لادێیەکە جێدێڵێت، بۆ دۆزینەوەی کار ڕوو لە تۆکیۆ دەکات. لە ساڵی ١٩٢٢ لە گەراجێکی چاککردنەوەی ئۆتۆمبێل وەك شاگرد کار دەکات. دوای دوودڵی لەسەر کارەکەی، بۆ ماوەی شەش ساڵ لەسەر کارەکەی وەك وەستایەکی پیشەسازی ئۆتۆمبێل بەردەوام دەبێت. لە ساڵی ١٩٢٨ لەتەمەنی ٢٢ ساڵی دەگەڕێتەوە لادێکەی، دەست بەکاری چاککردنەوەی ئۆتۆمبێل دەکات. سۆیچیرۆ لە یەکەم پێشبڕکی لە ژاپۆن، بە ئۆتۆمبێلی تێربۆچارج فۆرد بەشداری لە پێشبڕکێکە دەکات، بەڵام لە پێشبڕکێیەکەی تۆشی ڕووداو دەبێت و زۆر بەسەختی چاوی چەپی بریندار دەبێت، براکەشی بەهەمان شێوە بریندار دەبێت، دوای ئەم ڕووداوە واز لە پێشبڕکێکردن دێنێت. لە ساڵی ١٩٣٧ هۆندا کۆمپانیای تۆکای سەیکی بۆ دروستکردنی پیستۆن بۆ کۆمپانیای تۆیۆتا دادەمەزرێنێت، بەڵام لە دووەم جەنگی جیهانی فڕۆکە ئەمریکییەکان کۆمپانیاکە تێکدەشکێنن. ڕەگی کار و بازرگانی ملیار دۆلارەی هۆندا لەناو شکست و کەوتنەکاندا لە کیس دەدات. سۆیچیرۆ کاتێك وەك ئەندازیارێك چاوپێکەوتنی بۆ دەستکەوتنی کار لە کۆمپانیای تۆیۆتا ئەنجامدا، گەورەترین گورزی بەرکەوت، کاتێك لە کۆمپانیاکە ڕەتکرایە، بۆ ماوەیەك بێکار مایەوە، لە ماڵی خۆی دەستی بە دروستکردنی سکۆتەرز کرد. دروواسێکانی زۆر هانیاندا، تا لەکۆتایی بوو بە خاوەن کار و بازرگانی سەرمایەگوزاری خۆی.

# (١٩)

# خاوەنی کۆمپانیای (سۆنی)

## ئەکیۆ مۆریتا (Akio Morita)




ئەگەر گوێبیستی ناوی مۆریتا نەبوویت، گومان لەوەدا نییە کە گوێبیستی ناوی کۆمپانیاکەی بوویت بەناوی سۆنی. یەکەم کاری کۆمپانیای سۆنی بریتیبوو لە دروستکردنی ئامێرێکی چێشتلێنانی برنج، بەڵام بەداخەوە ئەم ئامێرە نەیتوانی بە گونجاوی کار بکات، چونکە برنجەکەی دەسوتاند. کەمتر لە سەد دانە لەم ئامێرە فرۆشرا، بەڵام یەکەم شکست هیچ کاری لە مۆریتا نەکرد. پشتبەستن بە توانای خۆی و هاندانی دۆست و نزیکەکانی، کۆمپانیایەکی چەند ملیار دولاری دامەزراند.

ئەکیۆ مۆریتا لە ساڵی ١٩٢١ لە شاری ناگۆیاو لە ژاپۆن لە دایکبووە. لە ساڵی ١٩٤٦ ئەکیۆ لە گەڵ هاوڕێکەی ماسارو ئیبوکا، کۆمپانیای ئەندازیاری تۆکیۆ بۆ پەیوەندیکردن دادەمەزرێنن. لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٠ کۆمپانیاکە گەشەی کرد و دەستی کرد بە دروستکردنی بەرهەمی تایبەت بە خۆی. کۆمپانیاکە توانی یەکەم ئامێری ڕادیۆی گیرفانی دروست بکات. دوای ئەوەی کۆمپانیاکە گەشەی بەرچاوی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەخۆوەبینی، ناوی کۆمپانیایەکەیان بۆ کۆمپانیای سۆنی گۆڕی. پاش چەند ساڵێك دوای ئەو گەشەکردنە بەرچاوەی کە کۆمپانیاکە بەخۆیەوەی بینی، بە هۆی ئەو داهێنانە مەزنانەی پێشکەشی دەکردن، کۆمپانیاکە نازناوێکی گەورەی بە دەست هێنا، لەوانە تەلەڤزیۆنی ترانزیزستەر لە ساڵی (١٩٦٠)، تەلەڤزیۆنی ترینیترۆن لە ساڵی (١٩٦٨)، تۆماری ڤیدیۆی بیتاماکس لە ساڵی (١٩٧٥)، هێتفۆن لە ساڵی (١٩٧٩) دیسك لە لە ساڵی (١٩٨٠) و یاری پلەی ستەیشن.

دواتر سۆنی پەرەی بە بواری پیشەسازی یاری دا، لە ڕێگای کڕینی کۆمپانیای وێنەی کۆڵۆمبیا و ستۆدیۆی وێنە جووڵاوەکان.

# (٢٠)

# بیرکاریناسی گەورەی جیهان



## ئەلبێرت ئەنیشتاین
## (Albert Einstein)

کاتێک باسی ناوی ئەنشتاین دەکرێت، زۆربەمان تەنیا بیر لە کەسێکی بلیمەت و زانا دەکەینەوە. لێ هەرئەوە نییە، کە بیری لێدەکەینەوە، چونکە ئەنیشتاین لە تەمەنی چوار ساڵی قسەی نەکردووە، لە تەمەنی حەوت ساڵی نەیتوانییوە بخوێنێتەوە، ئەمە وای لە مامۆستا و خێزانەکەی کرد، بیر لەوە بکەنەوە، کە ئەنیشتاین تووشی دۆخی کەم ئاوەزی بووبێت. ئەنیشتاین درەنگ فێردەبوو، کەسێکی دوورەپەرێز بوو، حەزی لە تێکەڵبوونی کۆمەڵایەتی نەدەکرد. لە کۆتاییدا، لە قوتابخانەکەی دوورخرایەوە، قوتابخانەی پۆلۆتەکنیکی زوریخ ئامادەنەبوو وەك قوتابییەك وەریبگرێت. لە کۆتاییدا توانی قەرەبووی هەموو ئەو شکستانە بکاتەوە و ببێتە خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ، ڕووی زانستی فیزیایی مۆدێرن بگۆڕێت.

ئەلبێرت ئەنیشتاین لە ١٤ی ئاداری ١٨٧٩ لە ئەڵمانیا لە خێزانێکی جوولەکە لە دایکبووە. باوکی ناوی هێرمان ئەنیشتاینە، لەگەڵ براکەی کۆمپانیایەکی دروستکردنی کەل و پەلی کارەبایی دادەمەزرێنن. ئەنیشتاین ماتماتیکناس و فیزیاناسێکی تیۆرییە، توانی پەرە بە تیۆری ڕێژەیی بدات، کە بە یەکێك لە کۆڵەکە گرنگەکانی فیزیای مۆدێرن دادەنرێت. کارەکانی ئەنیشتاین بەوە دەناسرێنەوە، کە کاریگەریان لەسەر فەلسەفەی زانست هەیە. لە ١٨ی نیسانی ١٩٥٥ماڵئاوایی لە جیهانی زانست دەکات. خێزانەکانی ناوی ئێلساو میلڤان، منداڵەکانیشی ناویان ئێدوارد و هانس و لیسێرلە. بە هۆی شیکارییەکانی کاریگەری فۆتۆ ئەلیکتریك خەڵاتی نۆبل لە ساڵی ١٩٢١ بەدەست دێنێت. دوای ئەوەی لای نازییەکانەوە هەڕەشەی لێ دەکرێت، بەرەو ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا کۆچ دەکات. کارەکانی کاریگەری بەرچاوی دەبێت لەسەر بەرەو پێشبردنی وزەی ئەتۆمی. لە کاتی شیکاری جەستەی ئەنیشتاین، تۆماس ستۆڵتز هارڤی، بەبێ ڕەزامەندی بنەماڵەکەی، مێشکی ئەنیشتاین بۆ مەبەستی لێکۆڵینەوەی زانستی، لە جەستەی دەردێنێت. هەرچەندە، ئەنیشتاین لەکاتی لێکۆڵینەوە زانستییەکان خۆی جەستەی خۆی دوای مردنی بۆ مەبەستی زانستی بەخشی بوو. هەنووکە، مێشکی ئەنیشتاین، لە سەنتەری بزیشکی زانکۆی پرینسیتۆنە. لەسەر وەسیەتی خۆی دوای مردنی، پاشماوەکانی دیکەی جەستەی دەسوتێنرێن و خوڵەمێشەکەشی لە شوێنێکی نهێنی بڵاودەکرێتەوە.

لە ساڵی ١٩٩٩ چەند زانایەکی کەنەدی هەڵسان بە لێکۆڵینەوەی مێشکی ئەنیشتاین، لەئەنجامدا بۆیان دەرکەوت، کەبەشی دواوەی مێشکی ئەنیشتاین لە خەڵکی ئاسایی جیاوازترە و پانزدە سانتیمەتر بەرینترە. بەپێی ڕۆژنامەی نیۆرك تایمز، توێژەران لەوباوەڕەدان ئەمە یارمەتی دەری بووە، لە هۆکاری زیرەکی ئەنیشتاین.

# (٢١)

# دۆزەرەوەی ڕەچەڵەکی مرۆڤ

## چارلس داروین (Charles Darwin)



لە سەرەتای ژیانی دا، داروین ڕەتی کردەوە کە لە پیشەی پزیشکیی کار بکات، بۆیە هەمیشە باوکی سزای دە دا، بە هۆی تەمبەڵی و زۆر خەوتنییەوە. داروین دەنووسێت: من لە دیدی باوکم و مامۆستاکانم بە کەسێکی ئاسایی و بگرە تەمبەڵ و خوار ئاستی مام ناوەند دەبینرام. پێدەچێت بڕیارێکی خێرایان دابێت، چونکە داروین بە هۆی لێکۆڵینەوە زانستییەکانی ناسراوە.

چارلس داروین بە هۆی کارەکانی وەك زانایەکی بواری سروشت و تیۆرەکانی بواری گەشەسەندن ناسراوە.

چـارلس ڕۆبـەرت داروین لـە ١٢ی شـوباتی ١٨٠٩ لـە شروسـبێری، ئینگلستان لەدایکبووە، لە ١٩ی نیسانی ١٨٨٢ ماڵئاوای یەکجاری دەکات. چارلس منداڵێکی خاوەن سەرمایە و پێگەی خۆی بوو، لە خێزانێکی زانستخوازی گەورەبووە، باوکی ڕۆبەرت بزیشکێکی ناسراو بوو، باپیری ئیرامسوس زانایەکی بواری ڕووەك بووە، کاتێکی داروین تەمەنی ٨ ساڵ بوو، سوساناى دایکی ماڵئاوایی یەکجارەکی دەکات. لە ساڵی ١٨٥٩ پەرتوکی ڕەچەڵەکی ڕەگەزی بونەوەران بڵاودەکاتەوە. داروین لەتەمەنی ١٦ ساڵی و لە ساڵی ١٨٢٥، لە زانکۆی ئێدنبرا، شان بەشانی براکەی ئیراسموس دەچێتە بەر خوێندن. پاش دوو ساڵ لە کۆلیژی کرایست لە کامبریج دەبێتە قوتابی. باوکی ئومێدەوار بوو وەك خۆی ببێتە بزیشك. بەڵام داروین بە هۆی دیمەنی خوێن دەبورایەوە. دواتر باوکی پێشنیاری بۆ کرد ببێ بە قەشە، بەڵام داروین زیاتر حەزی بە خوێندنی مێژووی سروشتی دەکرد.

دوای تەواوکردنی کۆلیژ و بەدەستهێنانی بڕوانامەی بەکالۆریۆس لە ساڵی ١٨٣١، لەگەڵ مامۆستای بواری ڕوەکناسی جۆن ستیڤس هێنسلو گەشتێکی پێنج ساڵی لەسەر ڕووی کەشتی بەدەوری گۆی زەوی ئەنجام دەدەن. لە کاتی گەشتەکەیدا، داروین چەندین ڕەگەز و توخمی جۆراوجۆری لە ڕوەك و گیاندار و بە بەردبوەکان کۆکردەوە، بە وردی لە بنەماکانی ڕوەکناسی و زەویناسی و زانستی ئاژەڵان و نموونەکانی کۆڵییەوە، ئەمانەش بونە هۆی دۆزینەوەکانی لە بواری گەشەسەندنی بونەوەران و شروستناسی.

# (٢٢)

# دروستکەری مووشەک




**ڕۆبەرت گۆدارد (Robert Goddard)**

هەنووکە گۆدارد بە هۆی ئەنجامدانی ئەو تاقیکردنەوە و توێژینەوانەی لەسەر ئەو مووشەکانەی کە بە وزەی شل کاردەکەن دەستخۆشی لێ دەکرێت. بەڵام لە ژیانیدا زۆرجار لای هاوپیشەکانی گاڵتە و سوکایەتی بە بیرۆکەکانی کراوە. هەنووکە مووشەك و گەشتە ئاسمانییەکان کارێکی مەحاڵ و دوور نین، ئەمەش بە هۆی کار و تێکۆشانی ئەو کەسەیە، کە لەسەردەمی خۆیدا، بۆی تێکۆشاوە. ڕۆبەرت گۆدارد دەڵێت: زەحمەتە بڵێی خەونی دوێنێ کارێکی مەحاڵە، هیوای ئەمڕۆ و ڕاستەقینەی بەیانییە.

ڕۆبەرت گۆدارد (١٨٨٢-١٩٤٥) بە باوکی پێشکەوتنی مووشەکی نوێ دادەنرێت. ڕۆبەرت گۆدارد فیزیاناسێکی بێ وێنەو کارامە و داهێنەر بوو. تا ساڵی ١٩٢٦، توانی یەکەم مووشەك لە ڕێگای بەکارهێنانی سوتەمەنی شل بە سەرکەوتووی تاقی بکاتەوە. هەڵدانی مووشەکی گۆدارد لە ١٦ی ئایار ١٩٢٦ وەك سەرکەوتنی برایانی ڕایت بە سەرکەوتنێکی گرنگی مێژوویی دادەنرێت. لە ساڵی ١٩١٤، دوو خەڵاتی داهێنانی لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا بەدەستهێنا، یەکێکیان بە هۆی بەکارهێنانی وزەی شل و ئەوی دیکەیان بە هۆی بەکارهێنانی وزەی ڕەق بوو.

لە ڕاپۆرتەکانی کۆتایی لە ساڵی ١٩٢٠ گۆدارد نەخشەی گەیشتنی مووشەك بۆ سەرمانگ دەکێشێت و لەڕێگای پاودەریشەوە دەتوانێت ئەوە دەربخات و بیسەلمێنێت. بەشدارییە ئەندازەییە مەزنەکانی گۆدارد لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٢٠ و ١٩٣٠ ئەنجامدرا. تا ساڵی ١٩٢٧ نزیکەی ١٠،٠٠٠ دۆلار لە دەزگای سیمسۆنیان وەردەگرێت. جێ پەنجەی گۆدارد لە پێشکەوتنەکانی مووشەکی ویلایەتە یەکگرتوەکان تەواو دیار و بەرچاوە.

# (٢٣)

# هەڵگری بیرۆکەی فیزایی کێشی سێو

## ئیسحاق نیوتن (Isaac Newton)



کاتێـك باسـی بیرکـاری دەکرێـت، گومـان لەوەدانییـە ک ە ئیسـحاق نیـوتن کەسێکی بێ وێنا و بلیمەتە، لەگەڵ ئەوەشدا لە سـەرەتای ژیانیـدا تووشـی چەنـدین شکسـت بـووە. هـەرگیز لـە قوتابخانـە سـەرکەوتنی بەدەسـت نـەهێناوە. کـاتێکیش کـرا بـە بەرپرسـی بەڕێـوەبردنی کـێڵگەی کشـتوکاڵی خێـزانەکەی، زۆر بـە سـەختی شکسـتی هێنـا. پـاش ئـەم ڕووداوە، مـامی کارەکەی لە ئەستۆگرت، ئیسحاقی بۆ خوێندن بـۆ کـامبریج نـارد، لـە وێـوە پشـکۆی سـەرکەوتنەکانی ئیسـحاق دەگەشـێتەوەو، بـەرەو پلیکانـەکانی

لووتکەی زانایی و دانای هەنگاو دەنێت، تا دەبێتە ئەو زانایەی ئێمە دەیناسین.

ئیسحاق نیوتن (٤ی کانونی دووەم ١٦٤٣-٣١ی ئایاری ١٧٢٧) فیزیاناس و ماتماتیکناسی ئینگلیز، بە هۆی یاسای کێشکردن ناوبانگی دەرکرد. توانی پەرە بە بنەماکانی فیزیایی نوێ بدات و لەناویشیاندا یاساکانی جووڵە. بە یەکێك لە بەهێزترین هزرەکانی شۆڕشی زانستی دادەنرێت لە سەدەی حەڤدە.

ئیسحاق نیوتن چەندین دۆزینەوەی لەبواری چاویلکەسازیی و جووڵە و ماتماتیکدا ئەنجامداوە، بەپێی تیۆری ئیسحاق نیوتن بێت، تیشکی سپی لەهەر حەوت ڕەنگەکەی شەبەنگە لە ڕۆژ پێکهاتووە. جگە لەمە نیوتن یەکێکە لە پێشەنگەکانی هەریەك لە بیردۆزی ژمێریاری جیاکاری و تەواوکاری.

داهێنانەکانی ئیسحاق نیوتن بریتین لە داهێنانی تیلیسکۆب لە ساڵی ١٦٦٨. وەك پرۆفیسۆرێك نیوتن ساڵانە لە زانکۆی کامبریج داوای پێشکەشکردنی کۆرسی وانەکانی لێدەکەن، ئەویش بابەتی چاویلکەسازیی بە دەسپێکی ئەو بابەتە هەڵدەبژێرێت. توانی تتیلیسکۆب بۆ لێکۆڵینەوەکانی چاویلکەسازی بەکاربێنێت و بە هۆی بەکارهێنانی تیلیسکۆب توانی بیردۆزی تیشك و ڕەنگ بسەلمێنێت.

لە نێوان ساڵانی ١٦٦٥-١٦٦٧ زانکۆی ترینیتی بە هۆی پەتای تاعون داخرێت. ئیسحاق نیوتن، بۆ لێکۆڵینەوە تایبەتییەکانی، دەگەڕێتەوە کۆلیژی زانکۆکەی، لەوێوە تیۆریی ئەفسانەی سێوەکە دەست پێ دەکات، بەپێی ئەم چیرۆکە ئەفسانەیە بێت، چونکێ تائێستا ڕاستی و درووستی ڕووداوی کەوتنی سێوەکە پشتڕاست نەکراوەتەوە. نیوتن لە ژێر دارێك دادەنیشێت و سێوێك بەسەر سەریدا بەردەبێتەوە، ئەمەش کتوپڕ بیردۆزی کێشکردنی لە مێشکی دەهێنێتە ئاراوە، هەرچەندە هیچ بەڵگەیەك نییە، کە سێوەکە بەر سەری کەوتبێت، بەڵام بینیویەتی سێوێك بەربۆتەوە و بە ئاراستەیەکی ڕاست نەك بە هیچ بە ئاراستەیەکی گۆشەییدا. لە دەرئەنجامدا بیردۆزی کێشکردن و جووڵەی لا گەڵاڵە دەبێت.

# (٢٤)

# یەکەم فەیلەسووفی مرۆڤی

**ســـــــوقڕات**
**(Socrates)**



هەرچەندە هیچ نووسینێکی تۆمارکراوی لە دوای خۆی جێنەهێشتووە، سوقرات بە یەکێك لە مەزنترین فەیلەسووفەکانی سەردەمی دوای سرووشت دادەنرێت. بە هۆی بیر و بۆچوونە نوێکانی لەو سەردەمدا، بە بێ ڕەوشت و تێکدانی ڕەوشتی گەنجان تۆمەتبارکراوە، هەر بۆیە دەستگیردەکرێت و بە مردن سزادەدرێت. هەرگیز ئەوانە بەربەست نەبوون لەبەردەمی، ئەو نەوەستا لە بڵاوکردنەوەی بیر و بۆچوونەکان و فێرکردنی گەنجان، دواتر بە کۆی دەنگی لۆردەکانی ئەسینا لە پرۆسەیەکی دیموکراسی سزایی یاسایی کوشتنی ژەهر خواردنی بەسەر دا دەسەپێت، لە ساڵی ٣٩٩ پێش زاینی سزاکە جێ بەجێ دەکەن بە دەستی خۆی ژەهرە کە دەخواتەوە.

سـوقرات فەیلەسـووفی یۆنـانی بـە سـەرچاوەی سـەرەکی ئایـدۆلۆجی ڕۆژئاوا دادەنرێت. کەمی لەبارەی ژیانی نـووسراوە، تـەنیا ئەوەنـەبێت، کـە بەدەسـتی قوتابییەکانییـەوە نـووسراوە و تۆمـارکراوە، لەوانە ئـەفلاتوون، ئەرستۆفانس، ئەکسانوفۆن. سوقرات لە ساڵی ٤٧٠ پێش زاینی لـە ئەسـینای یۆنـان لـە دایکبـووە. شـێوازی سـوقرات بەبنچینـەی سیسـتەمی لۆجیـك و فەلسەفەی مرۆڤـی ڕۆژئـاوا دادەنرێـت. سـوقرات کـوڕی سۆفرۆنیسکوسـی بیناسـاز و پەیکـەرتاش و فاینـەریتی دایەنـە. لەبـەر ئـەوەی لـە خێزانێکـی خانەدان و ناسراو نەبوو، تەنیا ڕێگەی پێدەدرێت پـەروەردە و خوێنـدنێکی سـەرەتای بخوێنێـت، هەربۆیـە لەتەمـەنێکی بچووکـدا پیشـەی بـاوکی فێردەبێت. سوقرات بەرلەوەی ژیانی خۆی بۆ فەلسەفە تەرخان بکـات، بـۆ چەند ساڵێك پیشەی بیناسازی کردووە.

سوقرات هاوسەرگیری لەگەڵ کچێکـی گـەنج بـەناوی زەنتیـپ دەکـات، سێ کوڕی بە ناوەکانی لامفـرۆکس و سۆفرۆنیسـکوس و مێنیزینوسـس لـێ دەبێت. بـەپێ یاسـای یۆنـانی بێـت هـەموو ئـەو پیاوانـەی، کـە تەمـەنیان لەنێوان (١٨-٦٠) ساڵی دایە، جەستەیەکی تەواو و شیاویان هەیە، پێویستە خزمـەتی سـەربازی ئـەنجام بـدەن. لـە جەنگەکانـدا سـوقرات بـە ئـازا و چاونـەترس نـاسراوە، لـە یـەکێك لـە شـەڕەکانـدا، جەنـەڕاڵێکی بـەناوبانگی سەربازی بەناوی ئەڵسیبیادس ڕزگار دەکات. سیفەتی ئازایەتی لە سوقراتدا بە درێژای ژیانی دەمێنێتەوە.

وێـل «دیورانـت» ی فەیلەسـووف لە کتێبـی چیرۆکـی فەلسـەفە[1]، بـە تێروتەسەلی باسی ڕووخسار و جەستەی سوقڕات کراوە. سوقرات پیـاوێکی جوان نەبووە. مرۆڤێکی بەژن کورت و خڕ و پڕ و لووتی کورت و چـاو زەق بووە. هەمیشە وادەردەکەوت، کە چاوت تێ ببڕێـت. تـوانی بەشـێوەیەکی جیاواز خەڵك بۆ خۆی ڕابکێشێت، نەك بە هۆی جـوانی جەسـتەو ڕواڵـەتی بەڵکوو بە هۆی لۆتف و گفتوگۆ جوان و بیـر و بۆچوونـە پـڕ بایەخـەکانی. هەمیشە جەختی لەسەر گرنگی مێشـك بەسـەر بەشـەکان و ئەندامـەکانی دیکەی جەستە دەکردەوە. ئەم بیر و بۆچوونـە، فـەلسـەفەی ئـەفلاتۆن بـۆ

[1] ـ قصة الفلسفة. دیل دیورانت. ترجمة الشیبانی. ص ٥٧-٥٨.

واقعی دوو جیهانی جیاواز دابەشی دەکات، ئەوانیش جیهانی هەست و ئاوەزن. بەوپێیە ئەوە تەنیا شتە، کە گرنگی هەیە. بەپێی بیر و بڕوای سوقرات بێت، فەلسەفە پێویستییە ئەنجامی کردەکی بۆ خۆشگوزەرانی کۆمەڵگا بەدەستبهێنێت. هەوڵیداوە سیستەمی ئەخلاقیی لەسەر مێشکی مرۆڤ ئەنجام بدات، بەڵام نەوەك لەسەر بنەمای ئاینی. ئاماژەی بەوە کردووە کە هەڵبژاردنی مرۆڤ پەیوەستە بە حەز و خولیای بۆ خۆشگوزەرانی. حیکمەتیش لە کۆتاییدا لە زانینی خودەوە دەبێت. مرۆڤ تا زیاتر بزانێت، توانای بیرکردنەوەی ژیرانەی بۆ هەڵبژاردنەکانی زیاتر دەبێت بۆ فەراهەمکردنی خۆشگوزەرانی.

بۆیە بەپێی سوقرات بێت لە سیاسەتدا ڕەنگدەداتەوە، بەوەی نە دەستەڵاتێکی زاڵم، نە دەسەڵاتێکی دیموکراسی باشترین سیستەمی حوکمڕانیی نین. بەڵکوو باشترین سیستەمی حوکمڕانی بریتییە لەوەی ئەو تاکانە حوکم بکەن، کە خاوەن توانا، زانیارین و بە تەواویی لە خودی خۆیان گەیشتوون.

# (٢٥)

# خاوەنی یەکەم تاقیگەی مێشک

## ڕۆبێرت ستێرنبێرگ (Robert Sternberg)

ئەم ناوە دیارە، لە نزمترین پلە لە قۆناغی یەکەمی کۆلیژ لە وانە بەراییەکانی دەروونناسی وەردەگرێت. دوا بە دوای ئەو هەرەسانە، ستێرن بێرگ بە پلەی نایاب لە زانکۆی ستانفۆرد دەردەچێت، لە کۆتاییدا بە سەرۆکی کۆمەڵەی دەروونناسانی ئەمەریکا هەڵدەبژێردرێت. ڕۆبێرت ستێرنبێرگ دەروونناسێکی ئەمەریکییە، لە ڕێگای بیردۆزەکانی خۆشەویستی و زیرەکیی و داهێنان ناوبانگی دەرکردووە. لە ٩ی دیسێمبەری ١٩٤٩ لە شاری نیوجەرسی لەدایکبووە. هەر لە تەمەنی منداڵییەوە حەزی لە بواری دەروونناسی



کردووە. دوای ئەوەی ئەنجامێکی باش لە تاقیکردنـەوەکان بەدەسـتدێنێت، درکـی بـەو ڕاسـتییە کـرد، کـەوا تاقیکردنـەوە پێـوەرێکی وورد نییـە بـۆ هەڵسـەنگاندنی زیرەکـی و توانسـت. کاتێـك هـەمان تاقیکردنـەوەی لـە ژوورێکی جیاواز، لەگەڵ کۆمەڵە قوتابییەکی گەنج ئەنجامدا، زیاتر هەستی بە دڵنیایی کردووە و ئەنجامەکەشی باشتربوو.

ساڵی دواتر، ستێرنبێرگ خۆی گەشەی بە تاقیکردنەوەی زیرەکـی دا، بـە تاقیکردنـەوەی سـتێرن بێـرگ بـۆ توانسـتی مێشـك نـاسرا. بـەڵام بـەهرە ئەکادیمییەکانی تاقیکردنەوە لاوازەکانی پێوەری توانستی هزری نیشاندەدا. لە وانـەکانی دەروونناسـی ئەوەنـدە خـراپ بـوو، مامۆسـتاکەی ئامۆژگـاری وەرگرتنی پسپۆرییەکی دیکەی بۆ دەکات. بەڵام، ستێرنبێرگ بەردەوام بـوو، تـوانی بڕوانامـەی بـەکالۆریۆس لـە یـەڵ لـە سـاڵی ١٩٧٢ لـە دەروونناسـی بەدەست بهێنێت، لە ساڵی ١٩٧٥ لە سـتانفۆرد بڕوانامـە دکتـۆرا بەدەسـت بهێنێت.

سـتێرنبێرگ هـەروەها بـە هـۆی توێژینـەوەکانی لەسـەر خۆشەویسـتی ناسراوە، بیردۆزییە سیانییەکەی بواری خۆشەویستی، پابەنـدبوون و سـۆز و دۆستایەتی وەك سێ پێکهاتەی گرنگی خۆشەویسـتی دەستنیشـان دەکـات. کاتێك ئەو سێ پێکهاتەیە بە شێوەی جیاواز یەك دەگرن، دەبنە هۆی جۆری جیاوازی خۆشەویستی.

# (٢٦)

# دروستکەری یەکەم فرۆکە

### ئۆرڤیل و ویلبەر ڕایت (Orville and Wilbur Wright)



(نـە ئۆرڤیـل، نـە ویلبـەر نـەچوونەتـە زانکـۆ، تـەنیا کـاسرینی خوشـکە بچووکەکەیان نەبێت.)

ئـەو دوو برایـە شــەڕی خــەمۆکیی و نەخۆشـیی بنەماڵەکـەیان نـەما تاقینەکەنەوە، بەر لە دامەزراندنی دوکانی بایسکل فرۆشتن، کـە بـوە هـۆی ئەنجامـدانی تاقیکردنـەوەی فـڕین. دوای ئـەوەی چەنـدین هـەوڵیان لـە

دروستکردنی ئامێری فڕین و کاری قورس و گراندا، دوای چەندین هەوڵی شکستخواردوو لە فرینی ئامێرەکە، دواجار توانیان فڕۆکەیەك دروست بکەن، لە ئاسماندا بخولێتەوە. ئۆرڤیل و ویلبەر ڕایت بە داهێنەر و پێشەنگی فڕۆکەوانی دادەنرێن، لە ساڵی ١٩٠٣ توانیان یەکەم فڕۆکە دروست بکەن، لە ئاسمان بخولێتەوە. ویڵبەر لە ١٦ی نیسانی ١٨٦٧ لە میلڤیڵ لە ئیندیانا لەدایکبووە. میلتن ڕایت باوکی لە یونایتد برەزێرن لە کلێسایەك قەشەبووە. دایکی ناوی سوزان کاسرین کۆیرنەرە. دایکیان هاوڕێی یاریکردنی ویلبەر، برا بچووکەکەی دەبێت، برا بچووکەکەی ئۆرڤیل لە ساڵی ١٨٧١ لەدایکبووە.

زۆرجار باوکیان یاری بۆ دەکڕین، ڕۆژێکیان یارییەکی هەلیکۆپتەری بۆ کڕیبوون، کەلە کاغەز و تەپەدۆر و دارحەیزەران دروستکرا بوو، بە ڕاکێشانی هێزی لاستیکەکەی باڵەکانی دەخولاندەوە، کە لای پێشەنگی فڕۆکەوانی فەرەنسی ئەلفۆنیس پینۆد دروستکرا بوو. هەر دوو برا سەرسام بوون بە دیزان و پیشەسازیی یارییەکە، ئەمەش لە ئەنجامدا حەز و خولیای بۆ فڕۆکەوانی زیاتر کردن.ویلبەر کەسێکی ژیر و چالاك و کراوە بوو، دوای تەواوکردنی ئامادەیی حەزی دەکرد لە زانکۆی یەڵ درێژە بەخویندنی بدات. لە ساڵی ١٨٨٥-١٨٨٦لە ڕووداوێکی یاری هۆکی سەر سەهۆڵ چەند گۆڕانێك بەسەر ژیانی داهات، کاتێك یەکێك لە یاریزانەکان خۆی پیداکێشا زۆر بە سەختی برینداربوو. هەرچەندە زۆربەی برینەکانی ساڕێژبوون، بەڵام ویلبەر کەوتە دۆخی خەمۆکیی، نەیتوانی بڕوانامەی ئامادەیی بەدەست بێنێت، پلان و خەونەکانی کۆلێژی هەرەسی هێنا. ویلبەر زۆربەی کاتەکانی بەخوێندنەوە لە پەرتوکخانەکەی ماڵەوە بەسەردەبرد، لەگەڵ ئەوەش چاودێریی دایکە نەخۆشەکەی (سوزان کۆیرنەر) دەکرد، کە لە ساڵی ١٨٨٩ بە هۆی نەخۆشی سیل کۆچی دوایی کرد.

لە ساڵی ١٨٩٢ ویلبەر و ئۆرڤیل دوکانێکی پایسکلیان دانا، پایسکلیان لەسەر ستایلی خۆیان دروست دەکرد و دەفرۆشت. برایانی ڕایت پرۆژە پیشەسازییە جۆراوجۆرەکانیان تاقی دەکردەوە، لەگەڵ ڕەوتی لێکۆڵینەوە نوێ و پێشکەوتنە تازەکان دەڕۆیشتن و چاودێریان دەکرد. زۆر بە وردی

چاودێری کار فڕۆکەوانی ئەڵمانی ئۆتۆ لیلینتالیان دەکرد، کاتێک ئۆتۆ بە هۆی هەرەسی بەفر ژیانی لەدەست دا، بڕیاریاندا خۆیان تاقیکردنەوەی فڕین تاقی بکەنەوە. دەستیان کرد بە دروستکردنی شێوە ئەندازەییەکان خۆیان، ڕوویان کردە کیتی هۆکی بە هۆی هەبوونی بای بەهێز لەو ناوچەیەدا.

لە ١٧ی دیسەمبەری ١٩٠٣ ویلبەر توانی سەرکەوتوانە فڕۆکەیەک بە بەرزی ٨٥٢ پێ بۆماوەی ٥٩ چرکە بفڕێنێت. بەڵام زوو برایانی ڕایت درکیان بەو ڕاستییە کرد، کە هیچ بەهایەك و ڕێزێك لە سەرکەوتنەکانیان ناگیرێت، خەڵك و ڕاگەیاندن و هاوڕێیانیان لێیان بێ ئومێدبوون. لە ساڵی ١٩٠٨-١٩٠٩ برایانی ڕایت و خوشکەکەیان ڕوویان لە ئەوروپا کرد، لە فەرەنسا لە کاتی فراندنی فڕۆکەکانیان ڕێزێکی زیاتریان لێدەنرا، توانیان سەرنجی خەڵك و ڕاگەیاندن و کاربەدەستان بۆ خۆیان ڕابکێشن. برایانی ڕایت توانیان ببن بە ئەستێرەیەکی بڕشنگدار لە پیشەی خۆیان، بەرلەوەی بگەڕێنەوە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا لە ساڵی ١٩٠٩دەستیان کرد بە فرۆشتنی فڕۆکەکانیان لە ئەوروپا.

# (٢٧)

# پیاوە گەورەکەی جیهان

## وینستۆن چەرچل (Winston Churchill)



وینستۆن چەرچل براوەی خەڵاتی نۆبڵ، دووجار وەك سەرۆك وەزیرانی شانشینی یەکگرتووی بەریتانیا هەڵبژێردراوە، لەگەڵ ئەوەشدا، هەمیشە لە ژیانی چێژی لە سەرکەوتنەکان وەرنەگرتووە. چەرچل زۆر بە ئەستەم قۆناغەکانی خوێندنی لە قوتابخانە بڕیوە، لە قۆناغی شەش سەرکەوتوو نابێت، شکست دێنێت و دەکەوێت. دوای قوتابخانەش لە ژیانی سیاسییدا، چەندین ساڵ تووشی شکستی سەخت دەبێت. لە هەموو هەڵبژاردنەکانی پۆستی حکومی، دوچاری شکست دەبێت و دەدۆڕێت، تاکوو دواجار لە تەمەنی ٦٢ ساڵی بە سەرۆکی حکومەت هەڵدەبژێردرێت.

لەسەردەمی ژیانی سیاسییدا، چەندین بڕیاری سیاسی دەردەکات، کە دواتر دەبنە هۆی مایەی شکستی گەورە. لە یەکەم جەنگی جیهانیدا سوپاکەی بۆ داگیرکردنی تورکیا دەنێرێت، بۆ ئەوەی لە باشوورەوە بە ڕوسیا ببەسترێتەوە، بەڵام دووچاری شکستی گەورە دەبێت. هەروەها لە ئەنجامی ناردنی سوپاکەی بۆ نەمسا و نیوزلەندا، چەندین سەربازی ئەو وڵاتە بونە قوربانی. لە دووەم جەنگی جیهانیدا، هەوڵی داگیرکردنی وڵاتی نەرویجی دا، بەڵام لە سەر دەستی سوپای ئەڵمانیاوە تووشی دۆڕان و شکستی گەورەبوو. سەرەڕای ئەو شکست و ڕەخنانەش، چەرچل بە یەکێك لە مەزنترین سەرکردەکانی سەدەی بیستەم دادەنرێت. لە ساڵی ١٩٥٣، بە هۆی نووسینی ئەو پەرتووکەی بەناونیشانی (دووەم جەنگی جیهانی ) خەڵاتی نۆبڵ بۆ ئەدەبیات وەردەگرێت. لە ساڵی ١٩٦٣، کۆنگرێسی ئەمەریکا شەرەفی هاوڵاتی ئەمەریکی پێدەبەخشێت.لە نێوان ساڵی ١٩٤٠ و ١٩٤٩ گۆڤاری تایم شەرەفی پیاوی ساڵ بە چەرچل دەبەخشێت.

چەرچل دەڵێت: هەرگیز، هەرگیز، هەرگیز بۆ هیچ شتێك خۆت بەدەستەوە مەدە، جا چ گەورە بێت یان سادە، بە بایەخ بێت یان لاوەکی.

( سەرکەوتن لە شکستەوە بۆ شکست گوزەر دەکات، بەبێ لەدەستدانی وره و گڕوتین)

(کەسی ڕەشبین ئاستەنگ لە هەموو هەلێك دەبینێت، کەسی گەشبین هەل لە هەموو ئاستەنگێك دەبینێت).

# (٢٨)

# سەرۆکە هەژارەکەی ئەمریکا



## ئەبرەهام لینکۆڵن (Abraham Lincoln)

لەگەڵ ئەوەی هەنووکە، وەك سەرکردەیەکی مەزن ڕێزی لێ دەگیرێت، ژیانی ئەبرەهام بە ئاسانی بەڕێوەنەچووە. لە تەمەنی گەنجییدا، وەك ئەفسەرێك بۆ جەنگ دەچێت، بەڵام وەك سەربازێکی پلە دوو لە جەنگ دەگەڕێتەوە. وادیارە شکست وا بەئاسانی بەرۆکی لینکۆڵن بەرنادات، لە

چەندین کاری بازرگانی هەرەس دێنێت و لە ژمارەیەکی زۆر لـە خولـەکانی هەڵبژاردن بۆ حکومەت شکست دێنێت.

شکستەکانی: ئەبرەهام لینکۆڵن.

لـە سـاڵی ١٨٣٢ کـار و پیشـەی لەدەسـت دەدات و لـە ئەنجومـەنی یاسادانان شکست دێنێت.

لە ساڵی ١٨٣٣ تووشی زەرەر و زیانی کاری بازرگانی دەبێتەوە.

لە ساڵی ١٨٣٥ خۆشەویستەکەی لەدەست دەدات.

لە ساڵی ١٨٣٦ تووشی ڕووخانی دەروونی دەبێت.

لە ساڵی ١٨٣٨ لە هەوڵی سەرۆکایەتی پەرلەمان هەرەس دێنێت.

لە ساڵی ١٨٤٣ لە پاڵاوتنی بۆ کۆنگرێس تێکدەشکێت و دەدۆڕێت.

لە ساڵی ١٨٥٤ لە پاڵاوتنی بۆ ئەنجومەنی پیران شکست دێنێت.

لـە سـاڵی ١٨٥٦ هەوڵـەکانی بـۆ جێگـری سـەرۆکی ئەمـەریکا شکسـت دێنن.

لـە سـاڵی ١٨٥٨ دووبـارە لـە پـاڵاوتنی بـۆ ئەنجومـەنی پیـران هـەرەس دێنێت.

دوای چەندین هەڵکشان و داکشان لە ژیانی پڕ نەهامەتییدا، لـە سـاڵی ١٨٦٠ ئـەبرەهام لینکـۆڵن بـە سـەرۆکی وڵاتەیـەکگرتوەکانی ئەمـەریکا هەڵدەبژێردرێت، ناوی دەچێتە مێژووی ئەو وڵاتە.

# (٢٩)

# لە سەربازییەوە بۆ کۆشکی سەرۆکایەتی ئەمریکا

## هاری س. ترومان (Harry S. Truman)



سەربازی دێرینی جەنگی یەکەمی جیهانی، سیناتۆر، جێگری سەرۆککۆمار، دواجار سەرۆککۆماری ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا، کەسێکی بێ کێشە نەبووە، چەندین جار هەنگاوی هەڵەی لە ژیانی ناوە، بۆ نموونە یەکێك لە هەوڵە شکستخواردنەکانی ترومان، کردنەوەی کۆگایەکی فرۆشتنی قەمیسی پیاوان و قوماش بووە، لە سەرەتادا کارەکانی تائەندازەیەك باش دەڕۆیشتن، پاشان مایەپووچ بوو، شکستی لە کارەکەی هێنا.

سی و سێیەمین سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە نێوان ساڵانی ١٩٤٥ و ١٩٥٣. لە ١٢ی نیسانی ساڵی ١٩٤٥ دوای مردنی ڕۆزفێڵت

دەبێتــە ســەرۆکی ویلایەتــە یــەکگرتوەکانی ئەمــەریکا. ســەرکەوتووانە ڕابەڕایەتی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکای لە جەنگی دووەمی جیهـان کردووە. لە ساڵی ١٩١٧، لـەکاتی جـەنگی یەکـەمی جیهـانی وەك سـەرباز ناوی تۆمار دەکرێت، لە بەرەکانی شەڕ لە ڕۆژئاوا خزمـەت دەکـات، تـاکوو لە کۆتاییدا پلەی فەرماندە بەدەست دێنێت. دوای گەڕانـەوەی لـە جـەنگ، دەبێتــە خــاوەن دوکــانی فرۆشــتنی کــەل وپــەلی پیــاوان، بــەڵام لەمــەدا سەرکەوتوو نابێت. لە ساڵی ١٩٢٢ بـە حـاکمی هـەرێمی هـەڵبژێردرا، لـەم پێگەیــە مایــەوە تــا ســاڵی ١٩٢٤. لــە ســاڵی ١٩٣٤ بــە ســیناتۆری وڵاتــە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا هەڵبژێردرا.

ترومان دەڵێت: لە ژیانی پیاوی مـەزن و ژنـی بـەناوبانگم کۆڵیوەتـەوە، بۆم دەرکەوتووە ئەوانەی لە لووتکەن، کە کارەکانیان بـە گـەرم و گـوڕیی و بە پەرۆشی و تێکۆشانەوە ئەنجام داوە.

# (٣٠)

# شارەزاکەی چوار خولی سەرۆکایەتی ئەمریکا



## دیك چینی

## (Dick Cheney)

بازرگان و جێگری سـەرۆککۆماری ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا بەر لەوەی بچێتە ناو کۆشکی سپی، نـەك جارێك بـەڵکوو دوو جـار لـە زانکـۆی یـەڵ دووردەخرێتـەوە. جارێکیـان جۆرج بۆشی سەرۆککۆماری پێشووی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا ئەم ڕاستییە دەدرکێنێت، بە گاڵتە بە دیك چینی دەڵێت: ئێستا دەزانین، ئەگـەر لـە زانکـۆی یـەڵ دەرچووبیـت، دەبیـت بـە سـەرۆککۆمار، ئەگـەر دوورخرایتەوە، دەبیت بە جێگری سەرۆککۆمار.

لە ساڵی ١٩٤١ لە نبراسکا لەدایکبووە، لە ساڵی ١٩٦٥ چۆتە نێو ژیـانی سیاسییەوە، زۆر بە خێرایـی بـەرەو دەسـەڵات هـەنگاوی نـاوە، ئەوەنـدەی پێناچێت دەبێتە یاریدەدەری جێگری پارێزگاری ویسکۆنسین. لە سەردەمی ڕیچارد نیکسۆن و جیراڵد فۆرد و جۆرج بۆشی باوك و کـوڕ کـاری کـردووە. لە ساڵی ٢٠٠٠ جۆرج بۆشی کوڕ بە جێگری خۆی دەستنیشانی دەکات، بـە هۆیـەوە دەسـتبەرداری بەڕێوەبـەری کۆمپانیـای هـالیبێرتۆن دەبێـت.دیـك

چینی لە بەدەستهێنانی متمانەی کۆماریخوازەکان بۆ خۆپاڵاوتن سەرکەوت و نەبوو، هەرچەندە لە کاتی کوشتنی ئوسامە بن لادن بە شان و باڵی باراك ئۆبامای هەڵدەدا، لێ زۆر بە زوویی وەك ڕەخنەگرێکی ئۆباما دەردەکەوت.

لە ساڵی ٢٠١٠ پێنج جار تووشی سستبوونی دڵ دەبێت، بەڵام ئەمە کاریگەری ناخاتە سەر نووسین و قسەکردنی. دیك چینی خزمەتی چوار خولی سەرۆکایەتی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکای کردووە، شارەزایی بووە لە بواری بەرگریی و وزە و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

# (٣١)

# پڕ داهاتترین هونەرمەندی گاڵتەجاڕی لە ئەمریکا



## جێری سینفێڵد (Jerry Seinfeld)

هەموو کەسێك لە دنیـای کۆمیـدیا بەم نـاوە ئاشـنان، جێـری ئـەو گەنجـە ڕشقانجار و کۆمیدیە بوو، کە یەکەم جار دەچێتە سەر تەختی شانۆ سەیری خەڵکەکە دەکات، ترس دایدەگرێت، جەستەی ڕەق دەبێت، خەڵك گاڵتـەی پێ دەکەن بە هۆی هاتوو هاوار لەسەر تەختی شانۆ ناچاری دەکـەن بێتـە خـوارەوە. بـەڵام سـینفێڵد چـارەی ئەمـە دەکـات، شـەوی دواتـر دووبـارە دەچێتەوە سەر سەکۆی شانۆ، کارەکەی ئەنجام دەدات، خەڵکـەکـە دەخاتـە قاقای پێکەنین و خۆشی. ئەوەی بەسەریشی هات لـە شکسـتەکان دەبێتـە مێژوو.

جێری سینفێڵد لە بروکلین، نیویۆرك لەدایکبووە، باوکی بەڕەگەز جوولەکەیەکی هەنگارییە، دایکیشی بەڕەگەز جوولەکەیەکی سوورییە. جێری دەچێتە کۆلێژی ئۆسویگۆ بەڵام دوتر دەگوازرێتەوە کۆلێژی کوینز لە نیویۆرك، لەوێوە دەکەوێتە حەز و خولیای شانۆی گاڵتەئامێز، چەند جارێك لە یانەکانی شەوانە خۆی تاقی دەکاتەوە، لەم ڕێچکەیە بەردەوام دەبێت. لە ساڵی ١٩٨٨ لەگەڵ لاری دەیڤد پرۆگلامێکی نمایشکاری بەرهەم دێنن، لە چوارم وەرزیدا، دەبێتە بەناوبانگترین شانۆی گاڵتەجاڕیی لە مێژووی تەلەڤزیۆنی ئەمەریکیدا.

دوای تەواو بوونی ئەم بەرنامە شۆخیئامێزە، سینفێڵد دەگەڕێتەوە شاری نیویۆرك بە مەبەستی درێژەدان بە کاری نمایشی تیتاڵی و ڕاستەوخۆ لەبەردەم بینەراندا. بەم شێوەیە سینفێڵد بوو بە ناوێکی درەوشاوەو گرنگ لە جیهانی گاڵتەئامێزی دا. بەپێی گۆڤاری فۆڕبس بێت. داهاتی ساڵانەی سینفێڵد لە ٢٠٠٤ بریتی دەبێت لە ٢٦١ ملیۆن دۆلار. لەنێوان ساڵانی ٢٠٠٨ و ٢٠٠٩ سینفێڵد ٨٥ ملیۆن دۆلار بەدەست دێنێت، بەم شێوەیە، پڕ داهاتترین هونەرمەندی گاڵتەئامێزی دەبێت لە جیهاندا.

# (٣٢)

# فلیمسازی بەناوبانگی هۆلیۆد

## فرێد ئەستایەر (Fred Astaire)



لـە یەکـەم تاقیکردنـەوەی تەلـەڤزیۆنی، بەڕێوەبـەری تاقیکردنـەوەی (م.ج.م) دەڵێـت: فرێـد کەسـێکی بـێ توانایـە، ناتوانێـت نوانـدن بکـات، ناتوانێت گۆرانی بڵێت، تەنیا دەتوانی تۆزێـك سـەما بکـات. سـەرەڕای ئـەو هەموو تێبینیانە لە بەڕێوەبەری تاقیکردنەوەکـە، فرێـد بـەردەوام دەبێـت، گۆرانیبێژ و ئەکتەر و سەماکەرێکی هەرە سەرکەوتووی لـێ دێتـە بەرهـەم، ئەو تێبینیەی کە کاتی خۆی بەڕێوەبەرەکە پێی دابـوو، لـە ژووری بیڤـەرلی هیڵ هەڵیدەواسێت، بۆ ئەوەی هەمیشە بیری بێتـەوە لـە کوێـوە هـاتووە. فرێد ئەستایەر سەماکەرێکی ئەمەریکی سەرتەختی شانۆو فیلمەکانە، زیاتر

بە هۆی چەند فیلمێکی گاڵتەچاڕی مۆسیقیەوە ناوی دەرکردووە، کە لەگەڵ جینجەرز ڕۆجەرزەوە بەرهەم هێنراون. لە ١٠ی مایسـی ١٨٩٩ لـە ئۆماهـا، نیبراسـکا لـەدایکبووە. لای زۆربـەی خەڵکـەوە، بـە مـەزنترین سـەماکەری مۆسیقی سەردەمە جیاوازەکان دادەنرێت.

ئەستایەر، وەك منداڵێك لەگەڵ خوشکە گەورەکـەی، ئـەدیل، دێتـە نێـو دونیای هونـەر. هـەردووکیان بەرلـەوەی بچنـە بـڕۆدوەی لـە سـاڵی ١٩١٧، گەشـتێکی مەیـدانی بـۆ ڤۆدەڤیـل ئـەنجام دەدەن. دوای پێشکەشـکردنی چەندین بەرهەم، ئەو خوشـك و برایـە ڕۆڵـی پاڵـەوانی لـە شـانۆگەری ( زە فەنی فەیس دەبیـنن). سـەرەڕای ئـەم سـەرکەوتنە زووە، لـە فیلمسـازی دا تووشی شکست دەبێت، بەتایبەتی دوای ئەنجامدانی تاقیکردنـەوەی سـەر شاشە، ناتوانێت هیچ سەرنجێك بۆ لای خۆی ڕابکێشـێت. لێـرەدا بەرپرسـی جێ بەجێکاری ئەوسا دەنووسێت: ناتوانێت گـۆرانی بڵێـت نـاتوانی نمـایش بکات، جگە لەوەی تۆزێکیش کەچەڵە، تەنیا دەتوانێت تۆزێك سەما بکـات. لە ساڵی ١٩٣٢ تووشی نسکۆیەکی پیشـەیـی دەبێـت، خوشـکەکەی ئـەدیل خانەنیش دەبێت و شوو بە سەرمایەداریکی بەریتانی دەکـات، ئەمـەش تـا ئەندازەیەك کاردەکاتە سەر کاری پیشەیی بە هۆی نـەمانی هاوبەشـەکەی، بەڵام پاشان بڕیار بدات هەنگاو بەرەو هۆڵیود بنێت، تـاکوو دیسـان لـەوێ لەبواری فیلمسازی ئەسپی خۆی تاوبداتەوە.

ئەستایەر زیاتر لە کاری تەلەفزیۆنیی دەردەکەوت، زیاتر گرنگی بەکاری شانۆی دەدا. ئەستایەر خەڵاتی ئۆسکار بـە دەسـت دێنێـت، بـە هـۆی ئـەو پاڵپشـتییەی لـە سـاڵی ١٩٧٤ لـە فیلمـی کارەسـات کـردی (زە تاوەرنـگ ئینفێرنۆ). جگە لەمە خەڵاتی ئیمی لە ساڵی ١٩٧٨ بەدەسـتهێنا، بـە هـۆی ئەو کارەی لە بەرنامەی تەلەڤزیۆنی (زە فامیلی ئەپساید داون ) پێشکەشی کرد. ئەوەنـدەی پێنـەچوو، ئەسـتایەر چەنـدین خـەڵاتی تـری بەدەسـتهێنا، لەوانە خەڵاتی ژیان، خەڵاتی پەیمانگای فیلمی ئەمەریکی، لە ساڵی ١٩٨١. ئەسـتایەر لـە ٢٢ی حـوزەیرانی ١٩٨٧ لـە لـۆس ئـەنجلوس، کالیفۆرنیـا ماڵئـاوایی یەکجـارەکی کـرد. بەمـەش هۆلیـود بەهرەمەنـدێکی مـەزنی لەدەستدا.

# (٣٣)

# پادشای کۆمیدیا

## چارلی چاپلن (Charlie Chaplin)

مەحاله بیر له پەخشکردنی فلیمێکی گاڵتەچاڕیی بکەیتەوە، بە بێ ڕۆڵی چاڕلی چاپلن، لە سەرەتا دا کاری نواندنی لای بەرپرسانی ستۆدیۆکانی هۆلی وود ڕەتکرایەوە، چونکە کارەکەیان بە کەم و بێ سوود دەبینی، چارلی خۆی بەدەستەوە نەدا، تا گەیشتە لووتکەی هونەری گاڵتەچاری. لە کاتی لە دایکبوونی چاپڵن، دایك و باوکی دوو هونەرمەندێکی کلاسیکی بواری مۆسیقی بوون، هەنانی دایکی کچی پینەدۆزێکە، لە ژیانی دا پشت بە پیشەیەکی



پڕ لە شکست و کەم داهات دەبەستێت. لەکاتێدا باوکی لەتەک گۆرانیبێژی میللی، لەگەڵ کارکردنی پیشەی قەساپ خەریک دەبێت.

چاپڵن ژیانی منداڵیی پڕ لە دەردەسەریی و هەژاریی دەقەتێنێت، ساڵانی زووی تەمەنی لەگەڵ دایك و براکەی لە ناوچەی کێنینگتۆن لە

لەندەن بەسەر دەبات. دایکی چاپلن هیچ داهاتیکی نەبوو، جگە لەوەی هەندێك جار کاری پەرستیاری و دروونی و فرۆشتنی جل و بەرگی دەکرد، لە کاتێکدا باوکی چاپلن هیچ یارمەتییەکی دارایی ماڵەوەی نەدەدا. لەبەر هەژاریی، چاپلن دەنێردرێتە خانەی چاکسازیی لە تەمەنی حەوت ساڵیدا، لەوێش ئەنجومەنی خانەی کار لە قوتابخانەی ناوەندی شاری لەندەن بۆ هەژاران دایدەمەزرێنێت، کە چاپڵن هەمیشە وەك شوێنێکی دژوار و فەرامۆشکراو ئەم شوێنەی لە یادەوەرییەکانی بیری دێتەوە. لە تەمەنی نۆ ساڵی بۆ ماوەیەکی کورت لەگەڵ دایکی یەك دەگرنەوە، بەرلەوەی هانا ناچاربێت منداڵەکانی بنێرێتەوە خانەی کار لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٨٩٨. منداڵەکان یەکسەر دەنێرێتە قوتابخانەی نۆڕوود، کە دەزگایەکی دیکە خێرخوازییە. ئەوەندەی پێنەچوو دایکی چاپلن تووشی نەخۆشی هات بە هۆی بەدخۆراکیی، بۆ ماوەی دوو مانگ لە نەخۆشخانە مایەوە، بۆیە منداڵەکانی لای باوکیانی جێهێشت، کە ئەستەم بوو منداڵە بچووکەکە باوکی بناسێت. باوکی چاپڵن ئەو کات ئاڵوودەی خواردنەوەی مەی ببوو، ژیان لەگەڵ ئەو پیاوە ئەوەندە دژواربوو، بۆیە کۆمەڵەی نیشتمانی دژی توونـدوتیژی منداڵان بۆ سەلامەتیان سەردانیان دەکردن. باوکی چاپلن لەتەمەنی ٣٧ ساڵی مرد، دایکی نەخۆشییەکەی دا بۆ ماوەیەکی لە کەم چاك بۆوە، بەڵام لە مایسی ساڵی ١٩٠٣ دووبارە نەخۆشی یەقەی گرتەوە، چاپلن ئەو کات لە تەمەنی ١٤ ساڵی دادەبێت بەناچاری دایکی دەباتە نەخۆشخانە. نەخۆشی بەرۆکی دایکی چاپڵن بەرنەدا، تا لە ساڵی ١٩٢٨ کۆچ دوایی کرد.

چاپلن لە تەمەنی پێنج ساڵی چووە سەر تەختی شانۆ، ئەمە یادگارییەکی تاڵ و شیرین بوو بۆ چاپڵن، تاڵ بوو چونکە دایکی لەسەر تەختی شانۆ لە کاتی گۆرانی گوتن دەنگی لەدەستدا لە هەمان کاتدا، شیرین بوو چونکە یەکەم جار بوو چاپلن دەنگی ببیسترێت، بۆ دڵنەوایی و پڕکردنەوەی ئەو بۆشایەی دایکی جێی هێشتبوو، بەڕێوەبەری شانۆ دەستی چاپڵنی گرت و بردی بۆ سەر سەکۆی شانۆ. بەداخەوە لەو شەوە بەدواوە، دایکی هەرگیز نەیتوانی لەبەردەم خەڵك گۆرانی بڵێت. دواتر چاپڵن

دەنووسێت: دایکم ئـەو هەسـتەی لا دروسـت کـردم، کـە مـن جۆرێـك لـە بەهرەم لە ناخدایە.

چاپڵن لـە تەمـەنی ١٣ سـاڵی واز لـە خوێنـدن دێنێـت، خـۆی بەچەنـد کارێك سەرقاڵ دەکات، بەڵام دەڵێت، هەرگیز خەونی بوونی بە ئەکتـەر لـە هــزری نــەچۆتــەدەر. لــە کۆتــایی دا چــاپلن بــوو بــە پاشــای کۆمیــدیا و گاڵتەچاڕیی، هەرچەندە لەگەل ئەوەشدا ناچار دەبێت بەرگەی هەژاریی و نەداریی و بێ پاڵپشتیی باوکیشی بگرێت.

# (٣٤)

# جوانترین و ناسراوترین ئافرەتی جیهان

## مارلین مۆنرۆ (Marilyn Monroe)

ئەفسووس ئەم ئەستێرەیە زوو درەوشانەوەی لە ئاسمانی هونەر دەکوژێتەوە، بەڵام بۆ ماوەیەك چێژی لە سەرکەوتنەکانی ژیانی بینیوە. سەرەتای ژیانی بە دژواریی دەست پێ دەکات، کاتێك، ئاژانسی نمایشکاران پێی دەڵێت: باشتر وایە تۆ پیشەی سکرتێری بگریتە بەر. مۆنرۆ بێ باك بوو لە هەموو بەربەستەکان، توانی ببێتە کەسێك وێنەی لە زۆربەی شوێنەکان هەڵبواسرێت، توانیی ببێتە نمایشکار و ئەکتەرێکی سەرکەوتوو، کە ئێستاش لە گوێچکەی خەڵکی بزرنگێتەوە.



مارلین مۆنرۆ لە یەکی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٦ لەدایکبووە، دایکی مۆنرۆ لە ڕووی دەروونییەوە، بارودۆخێکی ناجێگیری هەبووە، بەو هۆیەوە خراوەتە نێو خانەی نەخۆشی دەروونییەکان، هەر بەم هۆیەش مۆنرۆ ناچار دەبێت لە

هەتیووخانەیەکەوە بۆ خانەیکی دیکە هامووشۆ بکات، مۆنرۆ باوکی خـۆی نەدیوە.

لـە تەمـەنی ١٦ سـاڵی مێـرد بـە هـاوڕێ کوڕەکـەی، جیمـی دۆغـەرتی دەکات. مۆنرۆ لە تەمەنی سـاڵییدا ١٥ لـە قوتابخانـە دووردەخرێتـەوە. بـە مەبەستی کاروبار دۆغەرتی گەشت دەکات، لە ساڵی ١٩٤٦ کاتێك دۆغەرتی دەگەڕێتەوە، مۆنرۆ وەك نمایشکاری جل و بەرگ کار دەکـات، مـۆنرۆ ئـەو کات ناوی خۆی بۆ مارلین مۆنرۆ دەگۆڕێت، لە هەمان ساڵدا لەگەڵ جیمـی لەیەکتر جودا دەبنەوە.

بە هۆی زۆر ئامادەنەبوونی لە کۆمپانیای فیلمسازی توێنتیس سـێنچری فۆکس[١] دەردەکرێت، ئەمە جگە لەوەی بەرهەمهێنەرەکـەی وای بۆدەچـوو کە مـۆنرۆ کەسـێکی سـەرنجڕاکێش نییـە و بـەهرەی نوانـدنی تێدانییـە، شایستەی کارکردن لەو کۆمپانیایە نییە. سەرەڕای ئـەم هـەموو شکسـتەش، مارلین مۆنرۆ سووربوو لەسەر بـەدیهێنانی ئامانجـەکانی، بۆیـە لەکۆتاییـدا، بەبـەناوبانگترین کەسـاییەتی مۆسـیقای پـۆپ و ئەسـتێرەی سـینەمای لـە سەدەی بیست دەناسرێت.

---

١ The 20th Century Fox.-

# (٣٥)

# گەورەترین شێوەکاری جیهان

## ڤینسێنت ڤان کوخ (Vincent Van Gogh)



لە ماوەی ژیانکردنی دا، ڤان کوخ تەنیا یەك دانە لە وێنەکانی فرۆشت، ئەویش بە هاوڕێیەکی خۆی، بە پارەیەکی زۆرکەم. لە کاتێکدا، ڤان کۆخ هەرگیز لە ژیانی دا سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە، لە کار و پیشەی بەردەوام بووە، نە برسییەتی، نە هەژاریی چۆکی پێدانەداوە، زیاتر لە ٨٠٠ بەرهەمی ناوازەی کێشاوە، بەهاکەیان هەنووکە سەدان ملیۆن دۆلارە. لە هەموو ژیانیدا ڕەخنەگران بەکەسێکی شکستخواردوو ناویان دەهێنا. بەڵام ١٠٩ ساڵ دوای مردنی، خۆشەویستی کۆمەڵگای مۆدێرن بۆ وێنە

کێشراوەکانی ڕاستی توانستی داهێنانی بەرهەمەکانی قبوڵکرد، کە لە سەردەمی خۆی ڕەتدەکرایەوە.

ڤان کوخ دەڵێت: هەتا زانیاری شکست و هەڵەکانیشم لە هەڵەکردن نام وەستێنن. هەر کاتێك دەکەوم دووبارە هەڵدەستمەوە.

هیچ دایکێك وێنە کێشراوەکانی منداڵەکەی ناخاتە نێو بەفرگر، هەندێك لە دایکان ڕەخنەگرن و تەنانەت هەندێک جار توند و تیژیشن، ڕاستی بڵێین شیمانە هەندێك لەو وێنەکێشراوانە شایستەنەبن. هەرگیز ئەوەت بە خەیاڵ دا دێت دایکی ڤینسێنت ڤان کوخ گاڵتە بە وێنەکانی منداڵەکەت بکات. ئەمە کارێکی سەرشێتانەیە، بەڵام کاری سەرشێتانە بابەتی سەرەکی ژیانی ڤانە. لە سەرەتا دا دەستی کرد بە بازرگانی کاروباری هونەری لە لەندەن، ئەمەش لای بنەماڵەکەیەوە ڕێکخرابوو. دواتر هەوڵی کاری خزمەتکردنی ئاینی مەسیحی دەدات. هەرچەندە ڤان کوخ زۆر بە پەرۆش دەبێت، بەڵام لە تاقیکردنەوەی ئایینی سەرکەوتوو نابێت. ژیانی ڤان کوخ پڕە لە شکست دوای شکست، بێ ئومێدی دوای بێ ئومێدیی، کاتێك بۆی ئاشکرابوو، سەرەڕای پەرۆشی ناتوانێت ببێت بە قەشە، بۆیە ناچاربوو مل کەچی ڕاستییەکان بێت. ناچاربوو کۆڵنەدات ڕێگایەکی تر بدۆزێتەوە. ئەوەی ڤان کۆخی بە جیهان ناساند کۆڵنەدانی بوو، هەرگیز بۆ بەدیهێنانی مەرامەکانی وازی لە ڕێچکەی گەیشتن بە ئامانجەکانی نەهێنا.

ڤان دەیزانی قەدەری ئەو مەزن و گەورەییە، لە یەکێك لە نامەکانی بۆ تیۆی هاوڕێی دەنووسێت: تەنیا نیگەرانی من ئەوەیە چۆن ببمە کەسێکی سوودبەخش بۆ جیهان.ڕێچکەی ژیانی کورتخایەن بوو، تەنیا دە ساڵێکی خایاند، بە دەستی خۆی کۆتایی بەژیانی خۆی هێنا لە تەمەنی ٣٧ ساڵی. بەنەخۆشیی و هەژاریی سەری نایەوە، براکەی دەبوایە کاروباری ئابووری زۆربە ئیشەکانی بگرێتە ئەستۆ. لەڕووی بازرگانی و ئابوورییەوە سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە، بەڵام لە ماوەی سەد ساڵدا ناوی وەك ئەستێرەیەکی پڕشنگدار لە هەموو جیهان درەوشایەوە.

# (٣٦)

# داهێنەر و مۆسیقاری جیهان

## وڵف گانگ ئەمادیوس مۆزارت (Wolfgang Amadeus Mozart)

مۆزارت لەتەمەنی ٥ساڵی دەستی بە دانانی ئاواز کردووە، زیاتر لە ٦٠٠ پارچە مۆسیقای داناوە، کە لە ئەمڕۆدا بە بەرهەمێکی ناوازە دادەنرێن. بەڵام تەمەنی مۆزارت ئاسان و بێ کێشە نەبووە، زۆر بە نیگەرانیی و سەرگەردانیی ژیانی تێپەڕکردووە، تا دەبێتە هۆی دوورخستنەوەی لە پێگەی مۆسیقاژەنی شانشینی پاشا لە ساڵزبێرگ. هەربەم شێوەیە، بەردەوام هەوڵی بەدەستهێنانی پشتگیریی چینی ئەریستۆکراتی داوە.

مۆزارت ئەگەرچی ژیانێکی کورت ژیاوە لێ بەدەر نەبووە لە شکست، بەڵام هەندێك کاری ناوازە و جوانی مۆسیقای پێشکەش بە جیهانی مۆسیقا کردووە، هەرچەندە ڕێگاکەی گوڵ ڕێژنەکراوە، بەڵکوو پڕاو پڕ بووە لە شکست و سەرکەوتن. مۆزارت لە ٢٧ی کانونی دووەمی ساڵی ١٧٥٦ لەدایکبووە. منداڵێکی پشودرێژ و خاوەن کۆشش بووە. خۆشەویستی مۆسیقای لە باوکییەوە بۆی ماوەتەوە، کە لە سالسبێرگ یاریدەدەری



بەڕێوەبەری قەشەکان بووە. لە ساڵی ١٧٧٣، باوکی مـۆزارت هـەوڵ دەدات لــە دادگــای ئیمپڕاتــۆر لــە ڤێننــا دایمــەزرێنێت. ئـەو دامەزراندنــە وەك مۆسیقاژەنێك لە دادگا شكستی هێنا، ئـەو سـڵی لـەو شكسـتانە نـەكردەوە، بەردەوام هەوڵی بە دیارخستنی بەهرەكانی مۆسیقای دەدا، گەڕایەوە مـاڵ، لە ماڵەوە چەند پارچە مۆسیقایەكی ناوازەی دامەزرانـد، لەوانـە )ئـۆپرا ڕی پاستۆر، كریدۆ ماس)، كە لـە ڕووی هونەرییـەوە بـە )مـاس سـی مەیجـەر) ناوی دەركردووە.

شكســتێكی دیكــە بــەرۆكی مــۆزارتی گــرت، لــە كــاتی ئەنجامــدانی (هاوسەرگیری فیگارۆ) لەسەر سەكۆی شانۆی (ئەن پیر فەین). ڕۆژنامەیەك لــە زاری شــازادەی كۆشــكی ئیمپڕاتــۆر دەنووســێت، شــازادە دەڵێــت: زۆر بێزاركەر بوو، تێبینی زۆرمان هەبوو. لـە كۆتاییـدا، لـەنێوان سـاڵانی ١٧٨٨و ساڵی ١٧٩١، مۆزارت تووشی گەورەترین نشووست لە ژیانی بۆوە، ئەو سێ كارەی دواییni لە بواری مۆسیقا بە گەورەترین هەرەس دادەنرێـت. ژیـانی بە شێوەیەكی تراژیدی لە تەمەنی ٣٥ ساڵی لە ساڵی ١٧٩١ كۆتایی پێدێت.

ئەو مرۆڤە هەرچەندە تووشی چەنـدین چۆكشـكاندەوە و ڕەتكردنـەوە هــاتووە، بــەڵام گەنجینەیــەكی نــاوازەی لــە بــواری مۆســیقا لــە دوای خــۆی جێهێشتووە، كەس ناتوانێت نكۆڵی لەو بەهرەیە بكات.

# (٣٧)

# ئەستێرەیەکی دیاری مۆسیقای سەدەی بیستەم

## ئێلڤیس پرێسلی )Elvis Presley(



گۆرانیبێژ و ئەکتەری ئەمریکی ئێلڤیس ئارۆن پرێسلی ئەم هونەرمەندە بە پڕ فرۆشترین بەرهەم هەژمار دەکرێت، هەروەها بە یەکێك لە ئەستێرە دیارەکانی سەدەی بیست دادەنرێت. تەنانەت دوای مردنیشی ناوی لە زۆربەی ماڵەکاندا دەبیسترا. جگە لەمانە پرێسلی بە کاریگەرترین مۆسیقاژەن ناسروە. لێ کە باسی ژیانی پرێسلی دەکرێت لە ساڵی ١٩٥٤ پرێسلی کەسێکی وا نەبووە شایەنی باسکردن بێت، تەنانەت جارێکیان، جیمی دێلی بەڕێوەبەری (گراند ئۆلی ئۆپری) دوای ئەنجامدانی کارێکی دووری دەخاتەوەو پێی دەڵێت: تۆ ناتوانیت بۆ هیچ شوێنێك هەنگاو بنێیت، باشتر وایە دەست بەکاری شوفێری بارهەڵگر بکەیت.

# (٣٨)

## ئەو کەسەی بچمی مۆسیقای سەدەی نۆزدەی گۆڕی



**ئیگۆر ستراڤینسکی**

**(Igor Stravinsky)**

ئیگۆر لە ١٧ی حوزەیرانی ساڵی ١٨٨٢ لەدایکبووە، لە ٦ی نیسانی ساڵی ١٩٧١ ماڵئاوایی یەکجارەکی لە جیهان دەکات. ئیگۆر بەڕەچەڵەك ڕووسییە، لە بواری مۆسیقا و دانانی ئاواز و ڕابەری مۆسیقا ئەستێرەیەکی درەوشاوە بووە. دوای مردنی باوکی بەرە و سویسرا کۆچ دەکات، پاشان بەرە و فەرەنسا و ئەمەریکا کۆچ دەکات، لە ساڵی ١٩٧١ لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا ماڵئاوایی دەکات. کاتێك لە ساڵی ١٩١٣ ئیگۆر لە یەکەم دەرکەوتنی دا، نمایشی کاری بەناوبانگی ڕایت ئۆڤ سپرینگی کرد[١].

بینەرەکان لێی هەڵگەڕانەوە، ئاوازدانەرەکەیان بۆ دەرەوەی شار دوورخستە. وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم پارچە مۆسیقایە بوو، ڕێڕەوی هزر و بیری دانانی مۆسیقای لە سەدەی نۆزدە گۆڕی، بەم شێوەیە ئیگۆر پێگە و شوێنی خۆی لە مێژووی مۆسیقادا پتەوکرد.

---

١- Rite of Spring

# (٣٩)

# گرووپەی یەک ملیارد تۆماری دەنگیان فرۆشتووە



## بیتڵز (The Beatles).

بیتلز گرووپێکی مۆسیقای ڕۆکی ئینگلتەڕاییە، لە ساڵی ١٩٦٠ دامەزراوە، لەوەتەی دامەزراوە ١,٦ ملیارد تۆمارییان لەسەرتاسەری جیهان فرۆشراوە، نزیکەی ٦٠٠ ملیۆن تۆمارییان لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا فرۆشتووە، ئەم گرووپە بە بەناوبانگترین گرووپی مۆسیقا لە جیهان دادەنرێت، ئەندامانی ئەم گرووپە لە جۆن لینۆن، پۆڵ ماککارتنی، جۆرج هاریسۆن، ڕینگۆ ستار پێکهاتبوون.

کەم کەس هەیە نکوڵی لە هێزو کاریگەریی ئەم گرووپەی مۆسیقا بکات، تاکوو ئێستاش گوێگری لە سەرتاسەری جیهاندا هەیە. لەگەڵ ئەوەش، کاتێك ئەم گرووپە چالاکییەکانی خۆیان دەست پێکرد، کۆمپانیای تۆمارکردن، ڕەتی کردەوە، کار لەگەڵ ئەم گرووپە بکات، پێیان گووتن: کە وا حەز بە دەنگی ئەو گرووپە ناکەن، مۆسیقای گیتارەکەش زۆر نا تەواوە.

# (٤٠)

# ئەو میوزیکزانە مەزنەی نوێگەری لە مۆسیقا کرد



## لودویگ ڤان بیتۆڤن

## (Ludwig van Beethoven)

لە ساڵانی خۆ پێگەیاندنی دا، بیتۆڤنی لاو زۆر بە نامۆیی و نائاسوودەیی کاری لەسەر کەمانجەکەی دەکرد، سەرقاڵبوونی وای کرد بیتۆڤن لە دانانی ئاواز دووربکەوێتەوە، ڕاهێنان و مەشقەکان فەرامۆش بکات، سەرەڕای ئەم هەموو حەز و خولیایەی بەرامبەر ئاواز دانانی هەبوو. مامۆستاکانی درکیان بەوەکردبوو، کە بیتۆڤن هیوا بڕاو بووە لە مۆسیقا، هەرگیز لە ژەنینی کەمانجە، یان لە ئاواز دانان سەرکەوتوو نابێت. بەڵام بیتۆڤن سووربوو لە سەر ڕێچکەکەی، توانی هەندێك سەمفۆنیای پڕ چێژ و خۆش بۆ سەردەمە جیاوازەکان بەرهەم بێنێت، پێنج لەو سەمفۆنیایانە لە کاتی نابیستی دا بەرهەم بێنێت. بیتۆڤن دەڵێت: سوپاس بۆ خودا بیتۆڤن دەتوانێت زمانی مۆسیقا بنووسێت، چونکە جگە لەم کارە هیچ کاری دیکە نازانێت.

نمایشی یەکەم بۆ سەمفۆنیای (ژمارە نۆی بیتۆڤن) کارەساتێك و شکستێکی دیار بوو. بیتۆڤن لە ڤێننا لە حەوتی مایسی ساڵی ١٨٢٤ دەبێت یەکەم دەرکەوتنی لە تەمەنی ١٢ ساڵیدا بوو. کارەکانی ئۆکێسترا بەپێی پلان

بەڕێوە نەدەچوون، ئەوە گەورەترین ئۆکێسترابوو، کە ئەو ڕێکیخستبوو، لەو بۆنەیەدا بیتۆڤن لەگەڵ دوو گۆرانیبێژی ناوداری وەك سۆپرانۆ و ئەلتۆ بەشداربوو، هەرچەندە بەشێوەیەکی جوان ڕێکخرابوو، لێ ئەنجامدانی بێ ئومێدبوو.

ئەو شکستە بیتۆڤنی بێئومێد نەکرد، سەرەڕای ئەو دارمانە، خەڵکەکە بە چەپڵەڕێزان پێشوازیان لێکرد.

بیتۆڤن مۆسیقادانەرێکی کلاسیکی ئەڵمانییە، بە یەکێك لەو مۆسیقاژەنە بەناوبانگانە هەژماردەکرێت، کە سەردەمی مۆسیقای کلاسیکیی بۆ سەردەمی مۆسیقای ڕۆمانتیکی گواستۆتەوە. بیتۆڤن ڕەخنەیەکی زۆری لێگیراوە، لەسەر چۆنییەتی گرتنی ئامێری کەمانجە بەناڕێکی، تا مامۆستاکانی وەك دانەرێکی مۆسیقا لێی بێ ئومێدن.

ناخۆشییەکانی ژیان بیتۆڤن هەتا مردنی هەرگیز یەقەی بەرنادەن. لە سەرەتاکانی پێگەیشتنی، بیتۆڤن گوێچکەکانی بەتەواوی لە دەست دەدات، لەگەڵ ئەوەشدا توانی پێنج لە باشترین کاری ناوازەی مۆسیقا دابنێت، لەو سەردەمدا. ڕەخەننەکانی سەری بەردەوامبوون، ئەمجارە بیتۆڤن ڕەخنەی لێ دەگیرێت لەسەر شێوازی ئەنجامدانی مۆسیقا نوێگەرییەکەی، لەبەرئەوەی مۆسیقاکەی کلاسیکی نییە و نوێیە.

بیتۆڤن هەرگیز بەوە نەگەیشتووە کە شایەنی بووە، خەڵکیش درکی بە لێهاتوویی و کارامەیی ئەو داهێنەرە مەزنەی بواری مۆسیقای نەکردووە. بیتۆڤن بیرۆکە و ئاڕاستەیەکی نوێی هێنا ناو کایەی مۆسیقای کلاسیکیی، هەمیشە دەیگوت: لە کاتی دانانی مۆسیقا، وێنەی نوێ لە هزرم دایە، منیش بە دوای هێڵەکانی ئەو وێنانەم. سروشتی نوێگەری ناو ناخ و هزری، لە مامۆستا کلاسیکەکانی وەك هایدن و سالیری جیای دەکاتەوە. باوکە سالارەکەشی لەسەر هەڵە بچووکەکان ئازاری دەدا و لێی دەدا. ئەو شەپۆلانەی دژی تەوژمی بیتۆڤن بوون، نەیانتوانی بەربەستی لێهاتوویی و خولیای حەزی بیتۆڤن بۆ نوێگەری بشکێنن، تا ئاڵای سەرکەوتنی لەسەر ترۆپکی حەزەکانی شەکاییەوە.

# (٤١)

# لێهاتووترین یاریزانی تۆپی دەست




## مایکـــــڵ جـــــۆردن (Michael Jordan)

زۆربـەی خـەڵك بـاوەڕ بـەوە ناکەن، کـە ئـەو یاریزانـەی بـە باشترین یاریزانی تۆپی دەست لـە سـەردەمە جیاوازەکـان دادەنرێـت، ڕۆژانێـک لـە تیمـی تـۆپی دەسـتی قوتابخانەی ئامادەیی دوورخرابێتەوە. خۆشبەختانە ئەم نسکۆیە، چۆکی بـە جۆردن نەدا، جۆردن دەڵێـت: زیـاتر لـە ٩٠٠٠ لێـدانم لـە پیشـەکەم و ٣٠٠ یاریم لە دەست چووە. لە ٢٦ یاری دا، متمانـەی ئـەوەم پێبەخشرا لێـدانی بردنەوەی یاری لێ بدەم، بەڵام لە دەستم چوو. چەندین جار یەك لـە دوای یەك لە ژیانم تووشی شکست بووم، هەربۆیە من ئێستا سەرکەوتووم.

یەکێک لو گۆتە جوانەکانی مایکڵ جۆردن (هەندێك کـەس دەیانـەوێت سەرکەوتن بەدەست بێـنن، هەنـدێکیش هیـوا دەخـوازن، هەنـدێ کەسـی دیکە ئەنجامی دەدەن)

چیرۆکی نەبوونی ناوی لە پێکهاتەی تیمێکی قوتابخانەی ئامادەیی بۆتە بنێشتە خۆشەی سەر زاران، لە جیاتی ئەوە داواکرا لـە تیمـی یاریزانـە تـازە پێگەیشتووەکان یاری بکات. هۆکاری ئەم هەڵنەبژاردنەش بە هـۆی کـەمی کارامەیی و بلیمەتیی جۆردن نەبوو، کە جۆردن خۆی بە کەسێکی شایسـتە

نەزانێت، بەڵکوو تیمی پێگەیشتووانی قوتابخانە یانزە یاریزانی هەبوو، لەگەڵ سێ یاریزانی تازەپێگەیشتوو، ئەوەی مابوو، یەك یاریزان بوو شوێنەکە پڕ بکاتەوە، بەڵام ڕاهێنەر قوتابییەکی پۆلی دووی هەڵبژارد. جگەلەمەش ڕاهێنەران دەیانزانی ئەگەر جۆردن هەڵبژێرن ئەو تەنیا وەك یەدەگێك یاری پێدەکرێت، بۆیە بوونی ئەو لەگەڵ یاریزانە تازە پێگەیشتووەکان دەرفەتی زیاتری پێ دەدات.

لەگەڵ ئەوەی بڕیاری ڕاهێنەران بڕیارێکی تەواو ژیرانەبوو، بەڵام جۆردنی تەمەن پانزدە ساڵان تووشی ڕووخانێکی گەورە هات، کاتێك ناوی لە لیستی یاریزانە هەڵبژێردراوەکان دانەبوو، لای ئەو شکستێکی گەورەو کۆتایی پێهێنەربوو، جۆردن بۆ ماوەیەك دەچێتە ژوورەکەی خۆی دەرگا لەسەر خۆی دادەخات، هەرچەندە کەسی لەماڵ نەبوو ئەو کات، لێ بەتەواوی گۆشەگیر بوو، حەزی بە بینین و بیستنی کەس نەدەکرد. جۆردن ئەوەندە دڵی شکا، ئامادەبوو، بەیەکجاری واز لە وەرزش بێنێت، بەڵام دواتر دایکی توانی ڕازی بکات، لەسەر بەردەوام بوونی لە وەرزش.

دوای هەڵسانەوەی جۆردن، وەك پاڵەوانێك، هەرەسەکانی کردە پەیژەی سەرکەوتن بەسەر ئاستەنگەکاندا. جلەوی خۆی گرتە دەست و توانی لەسەر قاچەکانی خۆی بوەستێت و بەردەوام بوو لە یاری کردن لە تیمی یاریزانە تازە پێگەیشتووەکان، نەیهێشت نشوستەکان هاوسەنگی سەرکەوتنەکانی تێك بدەن.

شکست بووبە بەشێك لە ژیانی جۆردن و تێکشکاندنی کۆششەکانی، کینی گاتیسۆن، ڕکابەری سەرسەختی جۆردن دەڵێت: لای جۆردن ئازاری شکستەکان کاتیین، دەبنە بەشێك لە سەرکەوتنەکانی. یەکێکی دیکە لە بەربەست و ڕێگرییەکان لەبەردەم جۆردن ئەوەبوو کاتێك جۆرد بو بە خاوەنی بەشیك لە پشکەکانی یەکێتی تۆپی دەستی ئەمەریکا، چارلۆت بۆب کاتس، هەرچەندە جۆردن خاوەن پشکێکی کەم بوو تا ساڵی ٢٠٠٦، بەڵام دواتر زۆربەی پشکەکان لە بۆب جۆنسۆن کڕی، بوو بە خاوەن پشکێکی گەورە. جۆردن پارە و سەرمایەی خۆی تەرخانکرد بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانانەی بەر تیمەکەی کەوتبوون.

# (٤٢)

# دیارترین یاریزانی دۆپی سەرمێزی ئەمریکا




## ستان سمث (Stan Smith)

ئـــەم یاریزانـــەی تـــۆپی ســـەرمێز تەنانەت مافی ئەوەشی پێنـەدراوە لـە یارییـــەکان، بەتایبـــەتی لـــە پاڵـــەوانی داڤیس بۆ تـۆپی سـەرمێز، نەیـدەتوانی تۆپ بێنێتەوە، یان تۆپ بە یاریزانەکان بدات، بە هۆی ئەوەی کەسێکی خـاوو و خلیسك بوو، بەڵام لە ڕێگای بەردەوامبوونی، توانی ئەوە بسەلمێنێت، کـە هەموو ئەوانەی بە دێزی تەماشای دەکەن، هەڵەن. تـوانی ببێتـە پاڵـەوانی ویمبلدن[١]، لە ویلایـەتـە یـەکگرتوەکانی ئەمـەریکا، هەشـت جـار پاڵـەوانی داڤیس بۆ تۆپی تێنس بەدەست بێنێت.

---

[١] - Wimbledon, U. S. Open.

# (٤٣)

# باوکی هەژاران



## مـــــــەهاتما غانـــــــدی
## (Mahatma Gandhi)

غانـــدی بـــاوکی هەژاران لەوانەیـــە پـــڕ هێزبەخشـــترین چیرۆکی سەر ڕووی زەوی بێت، لە بنەڕەتدا لە هیندستان پیشەی پـــارێزەر بـــووە، بـــەڵام لـــەم پیشەیەدا سەرکەوتوو نـەبوو، چـونکێ نـەیتوانیوە بەکارامـەیـی پرسـیار لـە شایەتحاڵەکان بکـات. پـاش بەسـەربردنی چەنـد مـاوەیەک بـۆ ڕێکخسـتنی نامەی ناکۆکی یاسایی، بەرەو باشوری ئەفریقا سەرهەڵدەگرێت، لەوێ پەرە بە بەهرەی سیاسیی دەدات. ئەمەش ڕێگایەکی ئاسان نابێت بـۆ غانـدی،کە بزوتنەوەی ساتیاگراها، تەنانەت لە هیندسـتانیش، تووشـی چەنـدین کێشـە دەبێت. لەوانەیە گـەورەترین شکسـت لەسـەردەمی غانـدی جیابوونـەوەی پاکستان بوو لە هیندستان. غانـدی ٢٠ سـاڵ لـە باشـوری ئەفـەریقا بەسـەر دەبـات، بەرهەڵسـتی یاسـای جیاکـاریی دژی هیندییـەکان دەکـات، وەك ڕابـەری بزوتنـەوەی سـاتیاگراها، کـە بزوتنەوەیـەکی ئاشـتەوایی و دژی

تووندوتیژیی بوو. غاندی بووبە سەرکردەیەکی سیاسی و ڕابـەرێکی ڕۆحـی هیند.

بیرۆکەیەکی چاکە ئەگەر ئێمـە لێـرە لـە ژیـانی غانـدی بکۆڵینـەوە، بـۆ ئەوەی بتوانین بە هێمنی هەڵسوکەوت لەگەڵ شکستەکان بکەین. غانـدی، وەك هــەر کەســێکی دیکــە، بێبــەش نــەبووە لــە دۆڕان، زۆر باســی ســەرکەوتنەکانی دەکـەن، لـێ کـەم کـەس باسـی هەرەسـەکانی دەکـەن، پێویستە باسی ئـەو نشوستانەشـی بکـرێن، کـە دەبـن بـە وانـە بـۆ ئێمـە و نەوەکانی داهاتوو.

غانــدی لــە ٢ی ئۆکتۆبــەری ســاڵی ١٨٦٩لــە پۆڕبەنــدەر، هیندســتان لەدایکبووە. سەرەتای ژیانی بە سادەیی وەك هەرکەسێکی تر دەبێت، هیچ شتێکی نائاسایی لە ژیانی بەدی نەکراوە، تاکوو ببێتە مۆرکی ئەو نەمرییەی ئێستای لەژیانی بکرێت. ژیانی هەرزەیی و لاویی بە نائـارامی دەسـت پـێ دەکات، تەنانەت ژیانی بەدەرنەبووە لە هەوڵی خۆکوشتن.

لە ژیانی پیشـەییدا، وەك پارێزەرێـك، سـەرکەوتنەکانی سـنووردااربوون. هەر بۆیـە ئەگـەر چاوێـك بـە سـەرەتاکانی ژیـانی دابخشـێنینەوە، گۆتەی ئەلیکســاندەر کۆوادمــان وەبیــرەدێتەوە: هەنــدێك جــار شکســت و نەهامەتییەکانی سەرەتای ژیـان، ئامادەباشـییەکی باشـترن بـۆ سـەرکەوتنی درێژخایەن لە پێشکەوتنە پڕ کۆششەکان.

# (٤٤)

# ئەستێرەی بەناوبانگی سینەمایی بۆلیۆد

## ئەمیتاب باچچان
## (Amitabh Bachchan)



بە کەسایبەتییەکی هەرە سەرکەوتوو لە بۆکس ئۆفیسی بۆلی وود[١] دادەنرێت. شان بە شانی پیشەکەی، دەبێتە خاوەنی کۆمپانیای ئەمیتاب باچچانی سنووردار. چیرۆکی سەرکەوتنە کتوپڕ ولە پڕ شکستخواردنی، یەکێکە لە چیرۆکە کاریگەرەکانی ناو بۆلی وود، دواجار مایەپوچ دەبێت، بەڵام هەمیشە بە پێچەوانەی تەوژم و شەپۆلی گرفتەکان مەلەی دەکرد. لەو دووڕیانە هەستیارەدابوو، کاتی گەیشتنی زنجیرەی (ك ب س)، لە پیشەکەی قوڵپبوونەوەی تەواوی بەسەرهات، ئەمجارە بە هێواشی سەرکەوت و گەیشتە لووتکەی سەرکەوتن.

---

١ - Bollywood box-office

# (٤٥)

# گەورە هەڵسوڕاوی سیاسی ئەمریکا

## جەیمس کارڤیل (James Carville)



کاتێك منداڵ بووم، بە هۆی بانگەشە و هەڵمەتی سیاسی بێزار و هەراسان دەبووم، وەك ئەو منداڵانەی بە هۆی وەرزشەوە بێزار دەبوون. لەکاتی بانگەشەی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ئەمەریکا، لە ساڵی ١٩٩٢، هیچ کەس ئەوەندەی کلینتۆن کەسێکی هەڵسوڕاو چالاکوانێکی سیاسی باش و سەرکەوتوو نەبوو. لەلایەکی تریشەوە جەیمس کارڤیل بەم سەرو سیمایە، کەسێکی زۆر نە ناسراو بوو.

هەنووکە بە هەڵسوراوێکی گەورەی سیاسی ئەمریکا تەماشا دەکرێت. بەڵام لە سەرەتاکانی تەمەنی ٤٠ ساڵی بەر لەوەی کۆتایی بە بانگەشەی چارەنووسسازەکەی بێنێت، لە پڕ دەوەستێت. تەنیا لە چەند هەڵبژاردنێك بردنەوەی بەدەستهێنا. لە ژیانی دا هەرگیز نەبۆتە خاوەنی کارتی دڵنیایی.

جەیمس دەڵێت: کەس ناتوانێت جەیمس کارڤل بەوە تاوانبار بکات، کە خۆی بە مکووڕ نەزانێت.

# (٤٦)

# پیاوە ناسراوەکەی سوپەرمان

## کریستۆفەر ڕیڤ (Christopher Reeve)



ئەو مرۆڤەی ڕۆڵی سوپەرمان دەگێڕێت، بە هەموو جۆرێک پەکی دەکەوێت. بەرەو ڕووی کارەساتێکی گەورە بۆوە، بە هیچ شێوەیەک نەیدەتوانی دڵی خۆی بەم دۆخە خۆش بکات کە تێی کەوتبوو. دەپرسین تۆ بڵێی کەس هەبێت بتوانێت بەرگەی فرەچەشنی کەوتن بگرێت؟ کەچی ڕیڤ سوپەرمان ئاسا توانی لەگەڵ ئەم دۆخەدا بژیت و بەردەوام بێت.

كریستۆفەر ڕیڤ ئێژێ: بۆ بەیانییەكەی، پێویستیم بە بیست خولەكە تاوەكو بگرییێم و هەڵسمەوە و ئەم گۆڕانە ئەنجام بدەم، وەك دەزانن ئەمەش دەڕوات، بۆ ئەوەی خۆت بخەیتە ناو هەستی دۆڕاندن، پێویستە دان بەم ڕاستییە دابنێیت.

ئینجا دبێژێ، ) ئێستا كاتی بەرەو پێش چوونە).

ڕۆژانە پێویستی بە چەند ساتێك بوو، تا دان بەوە دابنێت، یان بیری خۆی بێنێتەوە، لە كوێوە دەستی پێ كردووە، ڕاستی بارودۆخەكەی چۆن بووە. بەڵام نەیهێشت ئەوانە ببنە ڕێگری، بەشێوەیەكی فراوان گەڕان و گوزەری دەكرد، وتاری گشتگیری بە ناوی (ئەوانەی لەژێر ئازاری بڕبڕەی پشت دەیان ناڵاند) پێشكەش دەكرد، بێوچان كۆمەكی دارایی بۆ خۆی و دەزگاكانی دیكە كۆدەكردەوە، تا وای لێهات ببێتە دەرهێنەری سینەمایی. ئەوەی ویستی بەدەستی هێنا، توانی بە باشترین شێوە یارمەتی كەسانی تریش بدات.

# (٤٧)

# نووسەر و ڕەخنەگری مەزن



**ئۆسکار وایڵد (Oscar Wilde)**

ئۆسکار وایڵد بەڕەگەز بەریتانییە، شانۆکار و نووسەری تـوانج و ڕەخنەگرتنـە، لـێ کەسێکی هاوڕەگەزباز بـوو بەم بیانووە وێلد بەند دەکرێت. سەرتا لە ژێر سەرپەرشتیکردنی دایك و باوکێکی سەرکەوتوو بوو، بەمە ئۆسکار زۆر بەفراوانی ئەستێرەی ژیانی دەگەشێتەوە، دواجار ناوبانگێکی زۆر دەردەکات.

زیندانیکردنی دەبێتە هۆکار کە ئۆسکار زۆر زوو ماڵئاوایی لە ژیان بکات. ئەوەی لێرەدا شایەنی فێربوونە، ئەو ئامادەبوو هەموو شتێك بدۆڕێنێت، کە دۆڕاندی، نەوەکوو خۆی وەك کەسێك نیشان بدات، کە ئەو کەسە نەبێت. هەرگیز توانا و بەهرەی ژێری نووسین و ڕەخنەگرتنی لە دەست نەدا.

لە وتە دیارەکانی ئۆسکار (ژیان ئەوەندە گرنگە دەکرێت بە مکووڕی قسەی لەسەر بکرێت).

# (٤٨)

# ئەو پێشکەشکارەی پێنج ملیۆن گوێگری هەیە




## تێری گرۆس

## (Terry Gross)

تێـر گـرۆس دوای شـەش هەفتـە لەپیشـەی مامۆسـتایەتی دوور دەخرێتـــەوە. تێـــر مامۆســتایەکی نــوێی زمــانی ئینگلیـزی بـوو، وەکـوو کەسێکی تـر هـەموو توانـای خـۆی لـەم پیشـەیە بەکارهێنا. تێری لە یەکێك لە قوتابخانەکانی بوفالۆ وانـەی دەگووتـەوە. لـە چاوپێکەوتنەکانی دا، وەها دەیخاتەڕوو: من نەم توانی پۆلی قوتابیان ڕێـك بخەم، نەم توانی هیچ وانەیەك بڵێمەوە، لە ئـەنجام هـیچ شـتێکم پێنـەکرا. ئەم کارەش تەنیا شەش هەفتـەی خایانـد، دواجـار تێـری خـۆی لـە دونیـای ڕاگەیاندن و ڕادیۆدا بینییەوە. یەکێک لەو پرۆگرامانەی پێشکەشـی دەکـات بەناوی (فرێش ئایـەر) نزیکـەی ٥ پێـنج ملیـۆن گـوێگری هەیـە و لـە ٤٥٠ وێستگەی جیاواز پەخش دەکرێت.

# (٤٩)

# وەرگری خەڵاتی نۆبڵ

## ساول بیلۆ (Saul Bellow)



پرۆفیسۆری زمانی ئینگلیزی نۆرمان ماکلینی ناودار لە باسکردنی بیلۆ سەرەکۆنەی دەکات: هیچ ئاماژەیەکی گەورەیی و مەزنایەتیی ئەدەبی لەم پیاوە بەدی ناکرێت. لە کۆتاییەکەی وەك شکستخواردوویەك دەری دەکات.

بەڵام بیلۆ لەبری ئەوەی چۆك بدات و دەستە ئەژنۆ بوەستێت، چەندین نووسینی بەهادار دەنووسێت، لەوانە (ئەدڤێنچەرز ئۆڤ ئۆگی مارچ) و (هەم بۆڵتس گیفت). دواجار خەڵاتی پولیتزەر و نۆبڵ لە ئەدەب و وێژە بەدەست دێنێت، خەڵاتی گوگنهەیم و مەدالیای نیشتمانی بۆ هونەر وەردەگرێت.

تەنیا نووسەرێکە سێ جاری جیاواز دەبێتە خاوەن خەڵاتی پەرتوکی نیشتمانی بۆ ئەدەبی چیرۆك و ئەندێشە. بە هۆی ئەو بەشدارییە گەرموگوڕەی لە هونەر و وێژەی ئەدەبی ئەمەریکی دا هەیبووە، دەبێتە خاوەن مەدالیای دەزگای پەرتوکی نیشتمانی.

# (٥٠)

# بەخشەری پەنجاو نۆ ملیۆن دۆلار

## لەیدی گاگا

## (Lady Gaga)



دوای سێ مانگ، لای ئایلەند دێف جام لە کارەکەی دووردەخرێتەوە، بە هۆی ئەم هەواڵە زۆر بەسەختی بریندار دەبێت و لەبەر زۆر گریانی لە قسەکردن دەوەستێت. هەنووکە ستێفانی گێرمانۆتە ئەستێرەی گۆرانی پۆپە، خاوەنی شەش خەڵاتی گرام و خەڵاتێکی سۆنگ ڕایتەرز هۆڵ ئۆڤ فەیمە. هەموو ساڵێك لە دەزگای فۆڕبس ناوی لە لیستی هونەرمەندانی ساڵدایە، هەروەها ناسراوترین چالاکیانەی کارێکی خۆبەخشییە کە بە بەهای ٥٩ ملیۆن دولار بۆ نەخۆشییەکانی ئایدز دەبەخشێت. لە مێژوودا کەسە گەورەکان شکستخواردووبوون، لەیدی گاگاش بەدەرنەبووە لەو جۆرەکەسانە، چیرۆکی گاگا سەرنجڕاکێشە، چونکە بە هۆی گرفتەکانی ناوی خۆی بۆ لەیدی گاگا دەگۆڕێت، لە بنەڕەتدا ناوی ستێفانی گێرمانۆتەیە و لە ساڵی ١٩٨٦ لە مانهاتن، نیویۆرک لەدایکبووە.

# (٥١)

# دەرهێنەر و هەڵگری خەڵاتی ئانگ




## ئانگ لیی(Ang Lee)

دووجــار لــە تاقیکردنــەوەی وەرگیرانــی لە زانکـۆ، لـە تـایوان شکســـت دەخـــوات، دواتـــر هەوڵــدەدات بچێتــە قوتابخانــەی شــانۆ، بــەڵام شــارەزانەبــوونی لــە زمانی ئینگلیزی لە پێشـی دەبێـتە بەربەسـت. لـە چاوپێکـەوتنێکی لەگـەڵ تۆڕی هەواڵی ئەی بی سی دەڵێت: هەمیشە شـەرمم لـە خـۆم دەکـرد، کـە نەمـدەتوانی سـەرنجی خـۆم بخەمـە سـەر پـەرتووك. هـەروەها لــە تاقیکردنـەوەی وەرگیرانـی کـۆلیژ شکسـتم هێنـا، باوکـەم بەڕێوەبـەری قوتابخانەبوو، ئەمەش بۆ من شتێکی باش نەبوو.

لە قوتابخانـەی شـانۆ بـە تـەواوی ئـاڵوودەی سـەردەپی شـانۆ دەبێـت، هەرچەندە لە زمانی ئینگلیزی شارەزایەکی تەواوی نەبوو.

هەنووکە، سێ جار وەك دەرهێنەر دەبێتە خاوەن خـەڵاتی ئـەکادیمیی، ئانگ ئەو کەسەیە، کە لەپشت سـەرکەوتنەکانی بەرهەمـە بەناوبانگـەکانی وەك (کراوچینگ تایگەر هیدن دراگـۆن)، (لایـف ئـۆف پـای)، )بـرۆك بـاك ماونتەین) هەن.

# (٥٢)

## پێشکەشکاری گاڵتەجاڕی بە توانا



**تینا فێی (Tina Fey)**

تینا فێی ئەو ئەکتەرە تیزانجاڕ[١]ییەیە، کە جێگا پەنجەی لەسەر هونەری گاڵتەجاڕی دیار و بەرچاوە، کە چاکسازییەکانی بواری کۆمیدیا لە دووەم گەورە شاری شیکاگۆ دەست پێ دەکەن، دواجار وەك نووسەرێك لە پرۆگرامێکی ڕاستەوخۆ بەناوی ساتردەی نایت بەکرێ دەگیرێت. لە شکستەکان بێباك دەبێت، تا لە ئەنجام دا دەرفەتێکی زێڕینی لە پرۆگرامی کۆمیدی شەوانی شەممە پێدەدرێت، بەو هۆیە لە تەواوی جیهان سەرکەوتن بەدەست دێنێت.

---

[١] - **تیزانجاڕ:** ڕشقانچاڕ، گاڵتەچاڕ، گاڵتەچی، کۆمیدی.

دوای ئـەوەی لـە پـەیژەکانی پرۆگرامـی گاڵتەئـامێزی شـەوانی شـەممە دەگاتە لووتکە، لە چەندین فیلم ڕۆڵی سەرکەوتوو و کاریگەر دەگێڕێت لە پرۆگرامی ڤێرتی ڕۆك.

تۆبلێ چۆن تینا گەیشتبێتە لووتکە؟ شکستەکان نەیانتوانی توانای هـزر و مێشکی سـەرقاڵ بکـەن، بـەڵام لـەوە تێگەیشـتبوو کـە دەستەوەسـتان و بێـدەنگیی دەرئـەنجامی باشـی نییـە، بۆیـە بڕیـار دەدات هەوڵـەکان چـڕ بکاتـەوە تـا نیشـانی هـەموو ئـەو کەسـانە بـدات، کـە بـە شکسـتەکانی پێدەکەنن. لەگەڵ ئـەوەش فێـی لـە پەرتوکەکـەی بـەناوی (بۆسـی پـانتس) چەند ئامۆژگارییەکی جیاواز بۆ ژنان لە شوێنی کارکردنیان دەخاتەڕوو.

# (٥٣)

# پێشەکەشکاری دیاری بەرنامەی (زە تونایت شۆ)

## کۆنان ئۆبرین (Conan O'Brien)



بۆ چەندین ساڵ هەوڵی بە دەستهێنانی پێشکەشکردنی پرۆگرامی )زە تونایت شۆ)ی دەدا، ئەمەش خەونێکی بوو، هەرچەندە خەونەکەی، بۆ ماوەیەکی کەم هاتەدی، چونکە (ئێن بی سی) پرۆگرامەکەی دایەوە دەست جەی لینۆ، کۆنان ماتەڵ مایەوە، ئەمەش شکستێکی گەورە بوو، کە بەرۆکی کۆنانی گرتبوو، ڕاستە جۆرە شکستە لە دەرەوەی دەسەڵاتی خودی کۆنان بوو، لێ هەرچۆنێك بێت، دەکرێت مرۆڤ وانەیەکی لێ فێربێت. مەرج نییە لە هەموو داتەپینێك دا تۆ تاوانباربیت، دەشێت

کەمتەرخەمییت نەنواندبێت لە بە جێگەیاندنی کارەکانت، بەرپرسیارەتی وەربگرە، بەرەو پێشەوە برۆ، وەلێ هە داڕوخانێک لە دەرەوەی دەسەڵاتی تۆدابێت، مەهێڵە کاریگەری نەرێنی بکاتە سەرت. کۆنان ئۆبرین دەڵێت: لە شکست مەترسە، لە هەر شتێک بترسیت یان نا بێ ئومێد بێت، هەر ڕووت تێ دەکات، جوانییەکە لێرەیە، لەگەڵ بێ ئومێدی ڕاستەقینە تێگەیشتن بەدەست بێنیت، لەگەڵ تێگەیشتن، ڕازی بوون و ڕەسەنایەتی ڕاستەقینە دێتە بەرهەم.

ئۆبراین نەیهێشت (ئێن بی سی) کاربکاتە سەر ڕوانگە و ڕەوشتی کارکردنی، لە دوایین گەشتی کارکردنی دا لەگەڵ ئێن بی سی، لە کۆتا زنجیرەی پڕۆگرامی (زە تونایت شۆ) کۆنان، دگوت: هەوڵێکی سەخت بدە، کەسێکی باش بە، پێشهاتی پڕچێژت بۆ دێتە ئاراوە.

کاتێك شکست بەسەر دەچێت، لە وتاری دەستبەکاربوونی لە دارتماوث وی دگوت: هیچ کاتێك باوەڕم نەکردووە لەمە زیاتر بێتە ئاراوە، شکست ئەگەر کردەی تۆ بێت یان نا، شکست بریتی نییە لە دۆخی خۆبەدەستەوە دان.

بینینی کەسانی تر لە هەڵکشان و داکشانەکان وەك دەرمان وایە، ڕۆح ئارام دەکاتەوە، ئەوەمان بیردێنێتەوە، کە ئێمە تەنیا مرۆڤین، بە تەنیا سەیرکردنی ئەو کەسانە، هەموومان دەگەینە ئەو ڕاستییە، کە بۆ سەرکەوتن شکست گەرەکە.

# (٥٤)

# دامەزرێنەری تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووک



## مارك زوكەربێرگ (Mark Zuckerberg)

ئەگەر بمانەوێت باسی مارك زوكەربێرگ بكەین، ئەوا دەبێت باسی فەیسبووک بکەین. مارك بە دامەزرێنەری پێگەی کۆمەڵایەتی فەیسبووک دادەنرێت، کە هەنووکە هەموو جیهان دەستی پێ دەگات. ئەو پلە و پایە و ناو و ناوبانگەی مارك ئێستا هەیەتی، لە سەرەتادا تێیدا بەرجەستە نەبووە. لە سەرەتای دامەزراندنی فەیسبووک بە ناوی ( The Facebook.com) لای کامیرۆن وینكلڤۆس و تایلەر وینكلۆڤس و دیڤیا نارێندا سکاڵای لە دژی تۆمار دەکرێت، لە دەرئەنجام پەرتەوازە و

شپرزەییەکی گەورە تووشی مارك بۆوە. دواتر ئەم کێشەیە بە بڕی ١,٢ ملیۆن دۆلار لە پشکی فەیسبووک چارەسەربوو.

بەر لە دامەزراندنی فەیسبووک، مارك (فەیس ماش) دادەمەزرێنێت، کە بریتی بووە لە سیستەمێك بۆ هەڵبژاردنی جوانترین وێنە لە نێوان کۆمەڵە وێنەیەکی کوڕان و کچان. هەرچەندە دواجار قوتابیان سکاڵای لە دژی تۆمار دەکەن، بە هۆی ئەوەی وێنەکان بەبێ ڕەزامەندی ئەوان بەکارهاتوون، ئەمەش نیگەرانی لێ دەکەوێتەوە، زانکۆی هارڤارد ئەم سیستەمە دادەخات، هەر بۆیە زانکۆی هارڤارد مارك زوکەربێرگ ناچار دەکات داوای لێبوردن بکات و پێگەکەش بە نەشیاو هەژمار بکات.

هەنووکە ناتوانین نکولیی لە سەرکەوتنی فەیسبووک بکەین، مارك زوکەربێرگ بە یەکێك لە دەوڵەمەندترین کەسایەتییەکانی جیهان دادەنرێت.

# (٥٥)

# بەڕێوەبەری گشتی کۆمپانیای ئەمەزۆن

## جێف بیزۆس (Jeff Bezos)



جێف بیزۆف بە دامەزرێنەر  و بەڕێوەبەری گشتی کۆمپانیای ئەمـەزۆن دادەنرێت، ئەستەمە وەك کەسێکی شکستخواردوو سەیر بکرێـت. یـەکێکە لە دەوڵەمەندەکانی جیهان، لە گۆڤاری تایم بە کەسایەتی ساڵ و بازرگانی ساڵ دادەنرێت. لەم ساڵانەی دواییدا کۆمپانیاکەی بـە بـڕی ٧٥ ملیـار دۆلار داهات کۆدەکاتەوە، بە بەهای ١٥٠ ملیار دۆلار بە دووەم بـڕ بـەهادارترین کۆمپانیا لە دوای کۆمپانیای عەلی بابا دادەنرێت.

کەچی لە سەرەتای کۆمپانیای ئەمەزۆن زیانێکی گەورە بە کۆمپانیایەکە دەگەیەنێت. لە ساڵی ١٩٩٨ کۆمپانیـای ئەمـەزۆن پێشـەنگی پـڕ فرۆشـتنی پەرتوك و مۆسیقا و فیلم و لە سەر هێڵی ئەنتەرنێت دەبێـت، بـەم شـێوازە

کۆمپانیای ناوبراو سەرمایەکی گەورە کۆدەکاتەوە، بەڵام جێف بیری لەوە دەکردەوە، کۆمپانیاکە بکاتە، کۆگای فرۆشتنی هەموو جۆرە کەل و پەلێك، هەربۆیە بڕیار دەدات کۆمپانیاکەی دەست بە فرۆشتنی یاری منداڵان بکات، بەڵام فرۆشتنی یاری منداڵان کارێکی جیاواز دەبێت، بە هۆی ئەوەی دابەشکەری سەرەکی لەم بوارە دا نەبوون. کڕینی یاری منداڵان لە کارگەکان و ئامبارکردنییان لە کۆگاکا پێچەوانەی سیستەمی کۆمپانیا بوو، کەچی جێف سوور بوو لەسەر ئەم کارەی سەرەڕای نارەزایی دەستەی جێبەجێ کار، تەنانەت بەشی فرۆشتنی یاری منداڵان، نزیکەی ٥ ملیۆن دۆلاری لە کڕینی یاری منداڵان خەرجکرا، بەبێ ئەوەی شوێنێك هەبێ بۆ فرۆشتنیان. دواجار کۆمپانیا زۆربەی یارییەکانی بەخشیە دەزگا و ڕێکخراوە خێرخوازییەکانی منداڵان.

جگە لەم هەڵەیە جێف چەندین هەڵەی تری وەبەرهێنان دەکات کە دەبنە مایەی شکستێکی بەرچاو. ئەگەر لە ڕوویێکی دیکە سەیری جێف بیزۆف و وەبەرهێنانەکانی تری بکەین، چیرۆکێکی جیاوازە، گوگڵ و ئایەر بی ئێن بی و ئوبەر هەموویان بەشێکن لە هەگبەی کەسی جێف بیزۆف. زۆر بە باشی سەرکەوتنەکانی قەرەبووی شکستەکان دەکەنەوە.

شکستەکانی جێف بیزۆف لەبەر دوو هۆ گرنگن: یەکەمیان بیزۆف وەك هەر خاوەن پرۆژەیەك بەهای شکست دەزانێت. جێف بیزۆف دەگاتە ئەو بوچوونە کە سەرکەوتنەکان بەبێ مەترسیی و شکست دەستەبەر نابن. دووەمیان لە هەمووی گرنگتر، بیزۆف لە هەڵەکان، چەندین وانە فێردەبێت. ڕاستییەکە لێرەدا بەرجەستە دەبێت، زۆربەی شکستەکانی بە هۆی لادانی لە ڕێچکەی سەرکەوتنەکانە، نەوەك بە هۆی سەرنجدان لە بەدەستهێنان و وەبەرهێنانی ئەو کۆمپانیایەی وەك ئەمەزۆن بیری کردۆتەوە یان هەڵسوکەوتی کردووە. بیزۆف ڕێچکەی جۆراوجۆری گرتەبەر لەو بوارانەی دژی ئەم فەلسەفەیە بوون. ئەم بیرو بۆچوونە شکستی هێنا، بەڵام بیزۆف شکستی هێناو لە کۆتاییدا سەرکەوتنی بەدەستهێنایوە، بە هۆی گونجاندنی کۆمپانیاکەی لەگەڵ ئاراستە تازەکانی سەدەی بیست و یەکەم.

# (٥٦)

# دامەزرێنەری ماڵپەڕی گووگڵ

## لاری پەیج (Larry Page)



چیرۆك و مێژووی گوگل و ئەندامی دامەزرێنەری لاری پەیج لە ساڵی ١٩٩٥ دەست پێ دەکات، کاتێك لاری پەیج ئەو قوتابییە بوو لە زانکۆی ستانفۆرد، بیرۆکەی دروستکردنی ئامێری گەڕانی لە مێشك دا گەڵاڵە بوو.

لاری پەیج و هاوڕێکەی سێرجی برین پێکەوە دەستیان بەکار کرد، دوای چەندین شەونخوونی و ماندووبوون. یەکەم پڕۆگرامی سۆفت وێری گەڕۆك سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێنا، ئەوەندەی پێنەچوو، بەهای بازرگانی پڕۆگرامەکە دەرکەوت. لەبەرئەوەی هەر دوو قوتابی دەیانویست بڕوانامەی دکتۆرا بەدەست بێنن، پڕۆگرامەکەیان خستە بەردەم چەند

کۆمپانیایەك بۆ فرۆشتن. مەبەستیان بەدەستهێنانی یـەك ملیـۆن دۆلار بـوو لەم کارەیان دا، بـەڵام نـەیانتوانی سـەرنجی کـەس بۆخۆیـان ڕابکێشـن. لـە سـاڵی ١٩٩٨دا توانیـان کۆمپانیایـەك دابمـەزرێنن، لاری پـەیجیش وەك بەڕێوەبەری گشتی بێت. تـا سـاڵی ١٩٩٩ گوگـل گەشـانەوەیەکی بـەرچاوی بەخۆیەوە بینی، ژمارەی فەرمانبەرانی لـە دوو کەسـەوە بـۆ سـەدان کـەس زیادی کرد، داهاتی لە سفرەوە بۆ ٢٥ ملیۆن دۆلار سەرمایە تێپەڕچوو.

دوای ئـەوەی چەنـد جارێـك لـە پۆسـتی بەڕێوەبـەری کۆمپانیـا دووردەخرێتەوە. هەرچەندە لە کۆتاییەکەدا چیرۆکەکە دەبێتە هۆی مایەی خۆشیی بـۆ لاری پـەیج، دووبـارە پۆسـتی بەڕێوەبـەری کۆمپانیـا بەدەسـت دەهێنێتـەوە، ئـەمجارە سـەرکردە و بەڕێوەبـەرێکی کارامـەتری لـێ دەخەملێت.

# کۆتایی.....

کەسە مەزنەکان لە مێژوودا، ڕۆژانێک کەسێکی شکستخواردوو بووینە. گومانی تێدا نییە، وەك کەسایەتییەکی سەرکەوتوو، یان وەك چیرۆکێکی سەرکەوتوو ئێستا باسی ئەو کەسانە دەکرێت. چیرۆکەکان وەك ئەفسانە وێنایان دەکەن، کەسەکانیش وەك پاڵەوانی مێژوون لە هزر و خەیاڵمان وێنەیان دەکێشین. ئەو کەسانە لە داستانەکان دا ئەوەندە شکستیان خواردووە، کە بەقەد هەموو سەرکەوتنەکانی مرۆڤایەتییە.

ناکرێت چاوپۆشی لە شکستی ئەو کەسایەتییانە بکرێت، کە ئێمە سەرسامین پێیانەوە، چونکە ئەوان لەناو مەلەی شکست فێربووینە، نەش و نومایان کردووە، تا لە کۆتای سەرکەوتنیان بە دەستهێناوە. ئێمە هەرگیز لە ژیان درکمان بەو ڕاستییە نەکردووە، کە سەرکەوتووترین کەسایەتییەکانی جیهان لە ناو شکستەکان شکۆفەیان کردووە. شکست ڕاهێنانێکی سادەیە هەم بۆ خودان تاقیکەرەکە و هەم بۆ ئەو کەسەی تاقیکردنەوەکە دەکات، بەڵام فێربوون پرۆسەیەکی سادەیە. کاتێك ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێت، کە پاڵەوانەکان وەك ئێمەن، دەزانین چۆن شکست بەرەو سەرکەوتنمان دەبات. هەربۆیە ئێمە لێرە دەستمان بە کۆکردنەوەی ئەو چیرۆکانەکردووە، کەباس لە شکستەکانی کەسە سەرکەوتووەکان دەکات، تا ببێتە زەنگێك هەموو کات ئەوەت بیر بێنێتەوە، ئەگەر هەر هەڵەیەکت کرد، یان دووچاری هەر شکستێك بوویتەوە، پێوستە هەڵسیتەوە سەرپێی خۆت و وانەیەکی گرنگی لێ وەربگریت، بزانیت تۆ هەمیشە لەسەر ڕێگای سەرکەووتنی.



## Rawand sabah

## ڕەوەند سەباح

- لە ساڵی ١٩٧٧ لە شارۆچکەی شەقڵاوە لە دایکبووە.
- خوێندنی سەرەتایی و ئامادەیی لە شەقڵاوە تەواو کردوە.
- لە ساڵی ١٩٩٦ بەکالۆریسی لە بەشی زمانی ئینگلیزی زانکۆی سەلاحەددین وەرگرتوە.
- لە ساڵی ٢٠١٠ ماستەری لە بەشی زمانی ئینگلیزی زانکۆی سلێمانی وەرگرتووە.
- ئێستا قوتابی دکتۆرایە لە بەشی زمانی ئینگلیزی زانکۆی سۆران.
- لەو ماوەی ڕابردوو چەندین وتار و کتێب و توێژینەوەی زانستی بڵاوکردۆتەوە.
- زیاتر لە (٢٠) توێژینەوەی زانستی نووسیوە.
- هەروەها زیاتر لە (٧) کتێبی لە زمانی ئینگلیزی وەرگێڕاوە و بە چاپ گەیاندوون.
-کتێبی مێژووی و زمان و دەیان وتاری پەروەردەیی و گەشەپێدانی مرۆیی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکان بڵاوکردۆتەوە.
- لە چەندین قوتابخانە و پەیمانگا و زانکۆی کوردستان مامۆستا و وتاربێژ و وانە دەڵێتەوە.
- ئێستا بۆماوەی (١٠) ساڵە لە زانکۆی تیشکی نێودەوڵەتی مامۆستایە.



# Dlshad Kawani
# دڵشادکاوانی

نووسەر و وەرگێڕ و چیرۆکنووس ڕۆماننووس و ڕۆژنامەنووس.
چالاکوان لە بواری ڕێکخراوەیی و مافەکانی مرۆڤ.
- ناوی دلشاد ڕەزاق ڕەسول، ناسراو بە (دڵشادکاوانی) .
- لەدایکبووی ۱۹۷۸/۷/۱ شاری قەزوینی ئێرانە.
- لە ساڵی ۱۹۸٤ لە گوندی کاوانیان شە قڵاوە چۆوەتە بەرخوێندن.
- یەکەم ویستگەی نووسینی لە ساڵی ۱۹۹٦ بە شعر دەستی پێکردوە.
- پاشان یەکەم چیرۆك بە ناوی هەرگیز پاشگەزنابمەوە لە ساڵی ۱۹۹۷نووسی، زیاتر لە ۲٤ چیرۆك و (۱۰۰) کورتیلە چیرۆکی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکان بڵاوکردۆتەوە، خەڵاتی یەکەم و دووەم و باشترین چیرۆکی لە فێستڤاڵەکانی کوردستان وەرگرتووە.
- لە ۱۹۹۸ وەك یەکەم کاری ڕۆژنامەنووسی لە ڕۆژنامەی یەکگرتوو لە گۆشەی لەگەڵ پیشەوەرێکدا زنجیرەیەك چاوپێکەوتنی تێدا بڵاوکردۆتەوە.
- پاشان لە ساڵی ۱۹۹۹ بۆتە پەیامنێری ڕۆژنامەی جەماوەر و پەیامنێری گۆڤاری گۆنا.
- لە ساڵی ۲۰۰۰ وەك پەیامنێری ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ کاری کردوە. لە هەمان ساڵ بۆتە بەرپرسی نووسینی سەنتەری ڕۆشنبیری شەقڵاوە.
- لە ساڵی ۲۰۰۱ بۆتە پەیامنێری کەناڵی ئاسمانی کوردسات و هاوکاری کەناڵی ناوخۆیی گەلی کوردستان و ڕادیۆیی مەڵبەندی هەولێر. وەك

ئەکتەرێکی شانۆی لە چەندین کاری شانۆیی بەشداری کردوە، کاری دەرهێنان و سیناریۆی شانۆی نووسیوە.
- لە ساڵی ٢٠٠٢ بۆوەتە بەرپرسی تیپی شانۆی سەفین و بەرپرسی لیژنەی شەقڵاوەی یەکییەتیی هونەرمەندانی کوردستان.
- لە ساڵی ٢٠٠٣ بەشداری لە خولی ڕاهێنانی iwpr ئەنیستیۆتی ڕۆژنامەوانی جەنگ و ئاشتی نێودەوڵەتی کردوە و وەك پەیامنیری ڕێکخراوەکە کاری کردوە کە ئۆفیسی سەرەکی لە بەغداد دە.
- لە ساڵی ٢٠٠٤خولێکی ڕادیۆی لە ڕێکخراوی imc ئەڵمانی بینیوە، وەك هاوکاری ڕادیۆکە کاری کردوە.
- لە ساڵی ٢٠٠٤ پەیامنێر و ڕێکخەری ئۆفیسی هەولێری ڕۆژنامەی بەیانی بووە، کە ئۆفیسی سەرەکی لە سلێمانی بووە.
- لە ساڵی ٢٠٠٥ زنجیرەیەك نووسین لە گۆشەیەك بە ناوی شتە ڕەزا قورسەکان لە وێب سایتی کوردستان پۆست بڵاو کردۆتەوە.
- لە ساڵی ٢٠٠٥ ڕیپۆرتاژێکی لە ژێرناوی (هەڵەبجەکانی تر) لە داگایکردنی صدام وەك بەڵگەیەکی نووسراو لە سەر دۆسیەی بالیسان و شێخ وەسان بەکارهێنراوە.
- لە ساڵی ٢٠٠٦ بۆوەتە پێشکەشکار و ئامادەکاری بە نارمەی بەدواداچوون و بەرنامەی خوان لە ڕادیۆی ئازادی لە شەقڵاوە.
- لە ساڵی ٢٠٠٧ بۆوەتە ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری سابات.
- لە ساڵی ٢٠٠٨ بۆوەتە ئەندام لە تۆری پەیامنێرانی بێسنوور.
- لە ساڵی ٢٠٠٩ بۆوەتە پەیامنێری ڕۆژنامەی مترۆی تایبەت بە هەڵبژاردن کە بەهاوکاری وەزارەتی دەرەوەی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق دەردەچوو.
- لە ساڵی ٢٠١٠بۆوەتە ئەندامی دەستی نووسەرانی گۆڤاری کوێستان.
- لە ساڵی ٢٠١٠ بۆوەتە ئەندام لە تۆری ئاژانسی هەواڵی ڕۆژنامەنووسی عێراقی.icc .
- لە ساڵی ٢٠١١ بۆوەتە ئەندامی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان.
- لە ساڵی ٢٠١٢ بۆوەتە ئەندامی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی نێودەوڵەتی.

- لە ساڵی ٢٠١٢ بەشداری لە تۆڕی ڕاهێنانی ڕۆژنامەنووسی هەڵبژاردن کردوە کە لە لایەن ڕێکخراوی ئینتەرنیوسی ئەورووپی و یونسکۆی سەر بە نەتەوە یەکگرتوەکان بوو وەك ئەندامی تۆڕەکە لە هەولێر بەشداری کردووە.
- ئامادەکار و پیشکەشکاری بەرنامەی هەمووان بەیەکەوە لە کە نالی سەما .srt.tv
- لە ساڵی ٢٠١٣ خەڵاتی باشترین چیرۆکی لە فیستڤالی لاوانی سۆران وەرگرتووە.
- لە ساڵی ٢٠١٤ بۆوەتە ئامادەکار و پێشکەشکاری بەرنامەی دیداری تایبەت لە کەناڵی نیشتمانی من.
- لە ساڵی ٢٠١٩ براوەی یەکەمی چیرۆکی فیسیڤاڵی ماڵی کتێبی لە هەولێر بەدەست هێناوە.
- لە ساڵی ٢٠٢٠ خەڵاتی ڕێزلێنانی سەرکەوتووترین چیرۆکنووس و ڕۆماننووسی لە لای سەنتەری ڕۆشنبیی شەقڵاوە پێبەخشراوە.
- لە ساڵی ٢٠٢٢ وەک یەکەم ڕۆماننووسی کورد بە ڕۆمانی بە ڕێگاوە بەشداری فیستیڤاڵی ئەدەبی گەلان (کۆمبلتنستی) لە وڵاتی ئیسپانیا دەکات.
- جێگری سەرۆکی سەنتەری هۆشیاری تاك و سەرۆکی ڕێکخراوی هیواینیشتمان NHO بۆ پەرەپێدانی تواناکانی مرۆیی لە کوردستان.

- نووسەر تاکوو ئێستا خاوەنی (١٠) خەڵات و زیاتر لە (٩) بڕوانامەی ڕێزلێنانی ئەدەبیی و ڕۆژنامەنووسییە، بە دەیان وتار و چاوپێکەوتن و نووسین لە ڕۆژنامە و گۆڤار و وێب سایتەکانی کوردستان و جیهان لە وانە ڕۆژنامە گاردیان و تایمز، ویب سایتی بەناوبانگی بەریتانی iwpr و چەند نووسینەکانی لە زمانی کوردی وەرگێردراونەتە سەر زمانی عەربی و ئینگلیزی.

- جگەلەوەی چیرۆکەکانی وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی فارسی و چەندین چیرۆکی لە فارسییەوە کردۆتە کوردی و لەبارەی فکر و مەعریفە دەنووسێت و خاوەنی دوو کتێبی چاپکراوە و شەش کتێبیتری ئامادەیە بۆ چاپ.

# ..پێرست..

| لاپەڕە | ناوەڕۆک | ژمارە |
|---|---|---|

**ژمارە ناوەڕۆک لاپەڕە**

| لاپەڕە | ناوەڕۆک | ژمارە |
| --- | --- | --- |